# (١٠) بنەما

# بۆ پاککردنەوەی دەروون


نووسینی:

عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر

وەرگێڕانی:

دەرباز گەرمیانی



١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز

# (١٠) بنەما

# بۆ پاككردنەوەی دەروون

نووسینی: عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر

وەرگێڕانی: دەرباز گەرمیانی

بۆ پۆلی دووەمی ناوەندیی دیراساتی ئیسلامی (نیدا)

ساڵی: ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز

ماڵپەری زادی
www.zadyreman.com

فەیسبووك
www.fb.com/zadyreman

تویتەر
twitter.com/zadyreman

ئیمەیل
Zadyreman@gmail.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنا وَمِنْ سَيِّئاتِ أعْمَالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أنْ لَا إلَـهَ إلَّا اللّٰه وَأَشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء: ١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب: ٧٠ - ٧١

أمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كِتابُ اللهِ، وَخَيرَ الهَدِيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ.

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەكی

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء، و خاتم المرسلين نبيّنا وقدوتنا وقرة أعيننا محمَّد بن عبدالله الهادي الأمين وعلى آله وصحبه أجمعين، ومن سار على هديهم إلى يوم الدّين، أمّا بعد:

ئەو دەروونەی كە لەناخی مرۆڤدایە ئەركی زۆر مەزنە، پایەشی زۆر گەورەیە، چونكە خوای پەروەردگار سوێندی بە هەندێك لە دروستكراوەكانی دەخوات كە مەزنی و كاربەجێیی پەروەرگار دەگەیەنێت، كە لە سورەتی (الشمس) دا دەروونی براوە و دەروونی دوڕاو ڕوون دەكاتەوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ۝١ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ۝٢ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ۝٣ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ۝٤ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ۝٥ وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ۝٦ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ۝١٠﴾ الشمس: ١ - ١٠

لەو فەرمایشتەی خوای گەورە كە دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ۝٩﴾ وشەی ﴿زَكَّاهَا﴾ هاتووە، لە بنچینەدا مانای زەكات زیادەڕۆیی كردنە لە خێر و چاكە، مەبەستی ئایەتەكەش ئەو كەسانەیە كە هەوڵ بۆ پاككردنەوە و ڕاستكردنەوەی دەروونی دەدات و هەروەها شكۆداری بكات بە عیبادەت و كاری باش، بە دووركەوتنەوەش لە شەڕەنگێزی و كاری خراپ سەركەوتنی مسۆگەر دەكات.

هەروەها ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار كە دەفەرموێت: ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ۝١٠﴾

وشەی ﴿دَسَّىٰهَا﴾ هـاتووە، کە بنچینـەی ئەم وشـەیە بە مانـای شـاراوە دێـت، چونکە کەسی سەرپێچیکار دەروونە پاکەکەی شاردۆتەوە بە کردەوەی خراپ، هەروەها بە کردەوەی ناشرین و سوك داپۆشیوە و بەکردنی کردەوەی نـابەجێ نوری دەروونی کوژاندۆتەوە و بە هیلاکی بـردووە، تـاوەکو دەروونـی بـووە بە دەروونێکی ئاست نزم و داڕووخـاو، بەو هـۆیەوە تووشـی نائومێـدی و دۆڕان دەبێت خوا پەنامان بدات.

(هەر بۆیە دەروونی ڕەند و ڕاست ڕازی نابێت بەشتێك نەبێت کە بەهای بەرز و بەنـرخ بێـت و چـاکترین بێـت و هەروەهـا باشـترین ئەنجـامی هەبێـت، بەڵام دەروونـی نـزم بەردەوام لە دەوروبەری شـتە نـزم و سـوکەکان دەخـولێتەوە و لەسەری دەنیشێتەوە، هەروەکو چۆن مێش لەسەر پیسییەکان دەنیشـێتەوە، هەر بۆیە دەروونی ڕەند و ڕاست بە ستەمکردن و کاری بەدڕەوشتی و دزی و ناپاکی ڕازی نابێت، چونکە زۆر لەوە مەزنتر و گەورەترە بەو شـتانە ڕازی بێـت، بەڵام دەروونی نزم و بێ نـرخ و چەپەڵ و داڕوخـاو بەپـێچەوانەی دروونـی ڕەنـد و ڕاستە، چونکە بەڕاستی هەر دەروونێك ڕوو لە هاو شێوەی خۆی دەکات)[١].

هەر بۆیە لەبەر ئەوەی پاککردنەوەی دەروون ئەوەندە گـرنگە پێویسـتە لەسـەر هەموو مسوڵمانێکی سەر ڕاست کە زۆر بەوردی ئاگاداری دەروونـی بێـت، وە جیهادی دەروونی خۆی بکات لە ژیانیدا بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە پیرۆزە، بۆ ئەوەی لە دونیـا و دواڕۆژدا سـەرفراز بێـت و چێـژی بەخـتەوەری ڕاسـتەقینە

---

[١] (الفوائد) لإبن القيم (ص١٧٨).

ببینێت.

چونکە دەروونی مرۆڤی مسوڵمان مافی هەیە لەسەری، هەروەکو پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقّاً)، واتە: بەڕاستی دەروونیشت مافی لەسەرت هەیە. هەروەها ئەو کەسەش هەڵەیە گەر وابزانێت مافی دەروون ئەوەیە بێ بەشی بکات تەنانەت لەو مافانەش کە خوای پەروەردگار بۆی داناوە و پێویستی پێیەتی، بەهەمان شێوە ئەو کەسەش هەڵەیە گەر وابزانێت مافی دەروون ئەوەیە کە پشتگوێی بخەیت و بە کەمتەرخەمی بەجێی بهێڵی و لەناو ئارەزووەکاندا نقوم بێت.

بەڕاستی پاککردنەوەی دەروون زۆر دوورە لەوەی بەو شێوەیە بێت، بەڵکو پاککردنەوەی دەروون بەو ڕێڕەوە دەبێت کە شەرع بۆی داناوە، بەشێوەیەکی مام ناوەند، کە نەکەمتەرخەمی نەزیادەڕۆیی نەبێت، بەڵکو بە پێی ڕێنماییەکانی پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) و بەرنامە بەپێزەکەی بێت.

لەم کورتەیەشدا دە بنەما و بنچینەی گرنگ باس دەکەم، کە یارمەتی مسوڵمان دەدات کە دروونی خۆی پاك بکاتەوە و گەشەی پێ بدات، هەروەها پاکی بکاتەوە لە هەموو شتێك کە پیسی بکات و ناشرینی بکات.

داواکارم لە پەروەردگار دەروونمان پاك بکاتەوە و کار و کردەوەمان چاك بکات، وتەمان ڕاست بکات و ڕێگای ڕاستمان پیشان بدات و شوێنکەوتنی خۆیمان پێ ببەخشێت، ڕێنماییمان بکات بۆ جوانترین ڕەوشت و کردەوە و

هەرچی ڕەوشت و کردەوەی ناشرینە لێمان دوور بخاتەوە، لە هەموو فیتنە و ئاشوبێکی نهێنی و ئاشکرا بمانپارێزێت، سەڵات و سەلام بڕژێ بەسەر پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و یار و یاوەرانی.

## بنەمای یەکەم:

## یەکتاپەرستی بنچینەی پاککردنەوەی دەروونە

یەکتاپەرستی ئەو ئامانجەیە کە لە پێناویدا خوای پەروەردگار دروستی کردین و ئێمەی هێنایە بوون، هەروەکو کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ الذاريات: ٥٦ واتە: بێ گومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

هەروەها تەوەری سەرەکیی بانگەوازی پێغەمبەرانیش بوو (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ)، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ۝٣٦﴾ النحل: ٣٦ واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر.

هەروەها یەکتاپەرستی یەکەم شتێکە کە پێویستە لەسەر مرۆڤ بۆ هاتنە ناو دینی ئیسلامەوە، بەهەمان شێوە یەکەم شتێکە کە پێویستە لەسەر بانگخواز کە خەڵکی فێر بکات، هەروەك پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێك مەعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: (إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ ما تَدْعُوهُمْ إِلَى أَنْ يُوَحِّدُوا اللَّهَ تَعَالَى)[1]، واتە: تۆ بانگەوازی گەلێك دەکەیت ئەهلی کیتابن، با یەکەم شتێك کە بۆی بانگیان دەکەیت

[1] بوخاری لەسەحیحەکەیدا هێناویەتی بەژمارە (٧٣٧٢).

یەکتاپەرستی بێت.

هەروەها خوای گەورە بەڵێنی سزای بە ئێشی داوە بۆ ئەوکەسانەی کە دەروونیان پاك ناکەنەوە بە یەکتاپەرستی و ئیمان لەڕۆژی دواییدا، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ٦ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ٧﴾ فصلت: ٦ - ٧ واتە: وەیل و سزای سەخت بۆ موشریك و هاوەڵگەران ئامادەیە، ئەوانەی کە زەکات نادەن و ئەوانەش کە بێ باوەڕن بە ڕۆژی قیامەت.

ئیبن تەیمییە (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (ئەو یەکتاپەرستی و ئیمانەیە کە دڵان و دەروونی پێ پاك دەبێتەوە، کە ئەوەش ڕەتکردنەوەی هەموو پەروەردگارێتییەکی باتڵ و سەلماندنی پەروەردگارێتی حەق لە دڵدا لەخۆ دەگرێت، ئەوەش ڕاستی (لا إله إلا اللـه)یە، ئەمەش ئەو بنەمایەیە کەدڵەکانی پێ پاك دەبێتەوە)[1].

ئیبنولقەییم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئان لە پێشین و دوای ئەوانیش دەفەرموون: ئەوە یەکتاپەرستییە؛ شەهادەتی (لاإله إلا الله)، وە ئەو ئیمانەیە کە دڵی پێ پاك دەبێتەوە... ئەوەش بنچینەی هەموو پاککردنەوەیەك و گەشەسەندنێکی دڵ و دەروونە...)[2].

هەروەك چۆن یەکتاپەرستی ئەو بنچینەیە کە دەروونی پێ پاك دەبێتەوە، بەهەمان شێوە هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە دەروون پیس دەکات و لەناوی

[1] مجموع الفتاوى (١٠/٩٧).

[2] إغاثة اللهفان (١/٧٩).

دەبات، بەڵکو هەمـوو کردەوەکـانیش پـوچەڵ دەکـاتەوە، وەکـو خـوای گەورە دەفەرموێـــــت: ﴿وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٥﴾ الزمر: ٦٥ واتە: سوێند بەخوا با دڵنیـابن کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆ و بۆ ئەوانەی پێش تۆش؛ ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریك بۆ خوا بڕیار بدەیت کار و کـردەوە چاکەکانیشـت پـووچەڵ دەبێـت و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

هەروەها شەریك دانان بۆ خوا ئەو تاوانەیە کە ئەگەر کەسێك لەسەری بمرێت خوای گەورە هەرگیز لێی خـۆش نابێـت، هەروەك خـوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ٤٨﴾ النساء: ٤٨ واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێـت ئەگەر هـاوەڵی بـۆ بڕیـار بدەیت، بێجگە لەوە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بـۆ ئەو کەسـەی کە دەیەوێت.

هەروەها خوای گەورە بەهەشتی حەڕام کردووە لەسەر ئەو کەسەی کە هـاوەڵی بۆ دائەنێـت، خـوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ٧٢﴾ المائدة: ٧٢ واتە: دڵنیـا بـن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان بەهەشتی لەسـەر حەرام کردووە ص شوێن و جێگا و سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسـا ئەو سـتەمکارانە هـیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە (کەس ناتوانێ فریایان بکەوێت).

جا ئەگەر بەندە یەکتاپەرستی لە خۆیدا بەدیهێنا ئەوە پـاکبوونەوەی تەواوەتیـی دڵ و دەروونی دەسـت دەکەوێـت، هەروەهـا ڕێنـوێنی و ئاسـودەیی و هێمنیـی تەواوەتیش بە دەست دەهێنێت لە دونیا و دواڕۆژدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢﴾ الأنعام: ٨٢ واتە: ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و ستەم و هاوەڵگەریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە، ئاسودەیی و هێمنی هەر بۆ ئەوانەیە، هەر ئەوانەش ڕێنومایی کراون.

جـا هەرکاتێـك بەنـدە بە دڵسـۆزی یەوە ملکەچـی خـوای گەورە بـوو و خۆشەویستی خۆی دەربڕی بۆ خوای گەورە ئەوکـاتە کردەوەکـانی دروسـتە و قبوڵکراوە و دەروونیش پاك و ئارام دەبێـتەوە، هەروەهـا هەرکـاتێکیش کـار و کردەوە خەوش و خڵتەی شیرك و هاوەڵگەری تـێکەوت ئەوکـاتە بەئەنـدازەی ئەو تاوانە دڵ و دەروون پیس دەبێت.

هەر بۆیە دەروون کاتێك پاك دەبێتەوە کە یەکتاپەسـتی بە دیهاتبێـت و بەتەنهـا ئەو بپەرستین و لە کار و کردەوەشماندا تەنها نیەتمـان بـۆ خـوا بێـت، خـوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ ٣﴾ الزمر: ٣ واتە: ئاگـاداربن دینـی پاك و خاوێن تەنها بۆ خوایە.

هەر بۆیە دەروون کاتێك پاك دەبێتەوە کە پـاك و پوخـت بکـرێتەوە لە شـیرك و هاوەڵگەری بە هەموو جۆرەکانیەوە، هەروەها بە پوختکردنی دەروون لە هەموو ئەو شتانەی کە یەکتاپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوە و لاوازی دەکات.

## بنەمای دووەم:

# دوعا و پاڕانەوە کلیلی پاککردنەوەی دەروونە

پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (لَيس شَيءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللَّهِ مِن الدُّعاءِ)[١]، واتە: هیچ شتێك لە پەرستشەكاندا لای خوای گەورە وەكو دوعا پیرۆز نییە.

بۆیە دوعا و پاڕانەوە لە باشترین پەرستشەكانە لای خوای گەورە، چونكە لە دوعا و پاڕانەوەدا نیشاندانی لاوازی و ملكەچی و شكانەوەی تێدایە و داننانە بە هێز و دەسەڵاتی خوای گەورە، هەروەها نیشاندانی دەوڵەمەندی و توانای دەوڵەمەندكردنی بەندەكانی و شكۆ و مەزنی خوای گەورەی تێدایە، هەروەها جێبەجێكردنی داوای ئەو كەسەی لێی دەپارێتەوە ئەگەر دوژمنیشی بێت، جا ئەگەر دۆست و خۆشەویستی خوای گەورە بێت و لێی بپارێتەوە بێگومان جێبەجێی دەكات[٢].

هەروەها دوعا و پاڕانەوە كاریگەریەكی مەزنی هەیە لە كردنەوەی دەرگای خێر و بەركەت، هەروەكو شیخ الإسلام لە وەسیەتەكەیدا بۆ ئەبو قاسمی مەغریبی دەفەرموێت: (الدُّعَاءُ مِفتاحُ كل خَيرٍ)[٣]، واتە: دوعا و پاڕانەوە كلیلی هەموو خێرێكە.

---

[١] ترمذي لە (جامع)ـدا ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٣٣٧٠)، هەروەها ئیبنو ماجە لە (سنن)ـدا بە ژمارە (٣٨٢٩)، شێخ ئەلبانیش لە (صحيح الجامع)ـدا بە ژمارە (٥٣٩٢) بەحەسەنی داناوە.

[٢] مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح (١٥٢٧/٤).

[٣] مجموع الفتاوى (٦٦١/١٠).

هەر بۆیە هەموو خێرێـك كە پێـت خۆشـە بەدەسـتی بهێنـی و خێـری دونیـا و دواڕۆژت دەوێ، تەنها داوا لەخـوا بـكە و بپـاڕێوە لێـی بـۆ بەدەسـتهێنانی ئەو خێرە.

بەڕاستی خـوای گەورەش بەڵێنـی داوە بە وەڵامـدانەوەی ئەو كەسـانەی لێـی دەپاڕێنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ۝٦٠﴾ غافر: ٦٠ واتە: ئەی خەڵكینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هانا و هاوار بۆ من بهێنن؛ ئەوە من دوعا و نزاتان گیرا دەكەم.

هەروەها ئەمیری باوەڕداران عومەری كوڕی خەتتاب (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) دەفەرموێـت: (إني لَا أَحْمِلُ هَمَّ الإجَابَةِ، وإنَّما أَحْمِلُ هَمَّ الدُّعَاءِ، فـإذا أُلْهِمْـتُ الـدُّعَاءَ فـإنَّ الإجَابَةَ مَعَهُ)[1]، واتە: من خەمی گیرابوونی پاڕانەوەم نییە، بەڵكو خەمی دوعـا و پـاڕانەوەم هەیە، چـونكە ئەگەر كەسـێك دوعـا و نـزا بكـات وەڵامەكەشـی لەگەڵیدایە.

(مُطرِّف بن الشِّخِّير) دەفەرموێت: (تَذكَّرتُ ما جِمَاعُ الخَيـرِ فـإذا الخَيـرُ كَثيـرٌ؛ الصَّومُ والصَّلاةُو وإذا هو في يـدِ اللَّـهِ عَـزَّ وجـلَّ وإذَا أنـتَ لاَ تَقْـدِرُ عَلَـى مـا في يدِاللَّهِ عَزَّ وجَلَّ إلَّا أنْ تسألَهُ فيُعْطِيَكَ، فإذا جماعُ الْخَيْـرِ الـدُّعَاءُ)[2]، واتە: بیرم لە كۆكەرەوەی هەموو خێر و چـاكەیەك كـردەوە، بەڵام كـردەوەی خێـر و

---

[1] ترمذي لە (جامع)ـدا ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٣٣٧٠)، هەروەها ئیبنو مـاجە لە (سنن)ــدا بە ژمـارە (٣٨٢٩)، شـێخ ئەلبانی لە (الترغيب) بە ژمارە (٢/٢٧٠) بە حەسەنی داناوە.

[2] ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی كردووە لە (الزهد) دا بە ژمارە (١٣٤٤).

چاکە زۆرە، وەکو نوێژ و ڕۆژوو، کە ئەمەش لە دەسەڵاتی خوای گەورەدایە، کاتێك کە تۆ توانات نەبێت بەسەر ئەوەی کە لە دەسەڵاتی خوای گەورەیە تەنها ئەوە نەبێت کە داوای لێ بکەیت و ئەویش پێت بدات، کەواتە کۆکەرەوەی هەموو خێر و چاکە لە دوعا و نزایە.

هەروەها پێغەمبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) لە (بەشی پاککردنەوەی دەروون)دا لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: (اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا)[١]، واتە: ئەی پەروەردگار داوات لێ دەکەم دەروونم بپارێزی لە هەوا و ئارەزوو و ئەنجامدانی تاوان، هەروەها دەروونم پاك بکەرەوە لە هەموو پیسی و ناشرینییەك و بەکردەوەی چاك جوانی بکە، کە هەر تۆ دەتوانی دەروونم پاك بکەیتەوە و هەر خۆتیش خاوەنیت.

لەم نزا و پاڕانەوەیەدا ئاماژە بەوە کراوە کە تەنها پەروەردگار توانای پاککردنەوەی دەروونی هەیە کە هەر خۆی زانایە بە غەیب و شاراوەکان، هەروەها کلیلە مەزنەکەشی نزا و پاڕانەوە و ملکەچی نیشاندانە بۆ خوای پەروەردگار.

هەر بۆیە زۆرترین دوعای پێغەمبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) ئەوەبوو کە دەیفەرموو: (اللَّهمَّ يا مُقلِّبَ القُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِك)، واتە: ئەی پەروەردگاری هەڵسوڕێنەری دڵەکان، دڵم لەسەر دینەکەت بچەسپێنە.

---

[١] ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا بە ژمارە (٢٧٢٢).

هەربۆیە کاتێك شتەکان لەسەر دڵی بەندە کۆدەبێتەوە، پاشان پێویستی و ملکەچییەکەی ڕاستگۆیانە بوو، هەروەها زۆر لە خوا پاڕایەوە، پەلەشی نەکرد لە وەڵامدانەوەی و کاتە پیرۆزەکانی نزا کردنی هەڵبژارد، ئەوکات ئەستەمە نزاکەی ڕەت بکرێتەوە.

مەزنترین شت کە یارمەتیت بدات لە دوعا و پاڕانەوەکانتدا ئەوەیە کە بزانی پاککردنەوەی دەروون تەنها لە دەسەڵاتی خوای گەورەدایە، چونکە خوای گەورە تەنها خۆی دەروونی ئەو کەسەی بیەوێت پاکی دەکاتەوە، هەموو دەسەڵاتێکیش لە دەستی خۆی دایە و بەویستی ئەوە، هەروەکو دەفەرموێت: ﴿بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ۝٤٩﴾ النساء: ٤٩ واتە: بەڵکو خوا (بەندەکانی دەناسێت) و هەرکەس (شایستە بێت، پەسەندی دەکات) و دڵ و دەروونی خاوێن دەکاتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ۝٢١﴾ النور: ٢١ واتە: ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەسەرتان ئەوە هەرگیز کەستان پاك و پوختە و ڕزگار نەدەبوون (لەدەست بوختانچییەکان، یاخود بە تەوبە پاك نەدەبوونەوە)، بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێت و شایستە بێت پاك و پوختەی دەکات و لە گوناهەکانی دەبورێت.

ئیبن عەباس (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا) لە تەفسیر و ڕاڤەی ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿مَا زَكَىٰ مِنكُم﴾ـدا دەفەرموێت: (مَا اهْتَدَى أَحَدٌ من الخَلائقِ لِشَيءٍ مِنَ الخَيرِ يَنْفَعُ بِهِ نَفْسَهُ، وَلَمْ يَتَّقِ شَيْئاً مِنَ الشَّرِّ يَدْفَعُهُ عَنْ نَفْسِهِ)[١]، واتە:

[١] ئیبن جەریری تەبەری لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە (٢٢٢/١٧).

ئەگەر ڕێنمـــوونی و هیـــدایەتی خـــوای گەورە نەبـــوایە ئەوە هـــیچ یەکێـــك لە دروستکراوەکان بە خێـر و چـاکە سـوود و قازانجیـان بەخۆیـان نەدەگەیانـد، هەروەها خۆشیان لە خراپە و خراپەکاری نەدەپاراست تا بەدوور بێت لە بەڵا.

واتە: هەمـــوو ئەو شـــتانە لە فەزڵ و منەتـــی خـــوای پەروەدگـــارە بەســـەر بەندەکانیەوە.

بەڕاء (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرموێـــت: پێغەمـــبەری خـــوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ڕۆژی (ئەحزاب)ـدا لەگەڵماندا خۆڵی دەگواستەوە، تاوەکو سکی موبارەکی بە خـۆڵ داپۆشرا، لەوکاتەدا دەیفەرموو:

وَاللَّهِ لَوْلَا اللَّهُ ما اهْتَدَيْنَا          وَلَا تَصَدَّقْنَا وَلَا صَلَّيْنَا[1]

واتە: سوێند بەخـوا ئەگەر فەزڵ و منەتـی خـوای گەورە نەبـوایە ڕێنمـوونی و هیدایەتمان وەرنەدەگرت و خێر و چاکە و نوێژیشمان نەدەکرد.

هەر بۆیە ڕێنموونی و هیدایەت و ئیمان و بیروباوەڕ و خێـر و چـاکە هەمـووی تەنها لە دەسەڵاتی خوای گەورەدایە، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەم بیـر و باوەڕەی لە دڵـی هاوەڵەکانیـدا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ) دەچانـد و بەردەوامـیش جەختـی لەسەر دەکردەوە، هەر لەبەر ئەمەش پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە دەسـپێکی وتاردا دەیفەرموو: (مَن يَهدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَن يُضْـلِلْ فَـلَا هَـادِيَ لَـهُ)[2]،

---

[1] بوخاری (٤١٠٤)، موسلیم (١٨٠٣)، لەفزەکەش هی موسلیمە.

[2] ئیمامی موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٦٨) لە فەرموودەی ئیبن عەبـاس (رضـي اللّـه عنهمـا)، هەروەها ئەبو داود لە (سنن)ـدا ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٠٩٧)، هەروەها ترمـذي لە (الجامع)ـدا ریـوایەتی کـردووە

واتە: هەر کەسێك خوای گەورە بەشایستەی بزانێت و ڕێنوێنی بکات و هیدایەتی بدات هیچ کەسێك ناتوانێت گومڕای بکات و سەری لێ بشێوێنێت، وث هەر کەسێکیش بەهۆی تاوانەوە خوای گەورە گومڕای بکات هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێی نیشان بدات و هیدایەتی بدات.

بۆیە ئەم بنەمایە مەزنترین بنەمایە لە بنەماکانی پککردنەوەی دەروون، هەرکەسێك زانی و بڕوای وابوو کە چاکسازی و پاکسازی دەروونی لە دەسەڵاتی پەروەردگاردایە، پەنا دەباتە بەر خوای پەروەردگار، هەروەها ڕوو دەکاتە دەرگای خوا و لێی دەپاڕێتەوە و سور دەبێت لەسەر داواکەی بە تکا و هیواوە، تا بەدەستهێنانی دەروون پاکی و ڕزگاربوون و سەرکەوتن لە دونیا و دواڕۆژدا لە پەروەردگارەوە.

---

بەژمارە (١١٠٥)، هەروەها نەسائی لە (السنن الكبرى) دا ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٢٧٧)، هەروەها ئیبن ماجە لە (السنن)دا ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٨٩٢)، هەموویان لە فەرموودەی عبداللە ی کوڕی مەسعود (رضي اللّٰه عنه) ریوایەتیان کردووە .

### بنەمای سێیەم:

## قورئانی پیرۆز سەرچاوە و یارمەتیدەری پاككردنەوەی دەروونە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾﴾ آل عمران: ١٦٤ واتە: سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران كاتێك پێغەمبەرێكی بۆ ڕەوانە كردوون لە خۆیان، ئایەتەكانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاك و پوخت دەكاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەكات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەكی ئاشكرادا ڕۆچووبوون.

هەر بۆیە مەزنترین شتێك كە دەروونی پێ پاك ببێتەوە قورئانی پیرۆزە، كە هەر خۆی كتێبی پاككردنەوەی دەروون و سەرچاوە و یارمەتیدەر و بنچینەیەتی، هەر بۆیە هەر كەسێك ویستی دەروونی پاك بێتەوە ئەوە با لە قورئانی پیرۆزدا هەوڵی بۆ بدات.

ئیبن عەباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) دەفەرموێت: (ضَمِنَ اللَّهُ لِمَنْ اتَّبَعَ الْقُرْآنَ أَن لَّا يضلَّ فِي الدُّنيا ولا يَشْقَى فِي الآخِرَة، ثُمَّ تَلَا هذِه الآية: ﴿فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾﴾ طه: ١٢٣)[1]، واتە: هەركەسێك شوێن ڕێنماییەكانی قورئانی پیرۆز بكەوێت، ئەوە خوای گەورە دەستەبەری دەكات كە نە لە دونیا گومڕا ببێت و

[1] ئیبن ئەبی شەیبە لە (المصنف)ـدا ڕیوایەتی كردووە بەژمارە (٣٥٩٢٦).

نه لە دوارۆژیش بە هیلاك بچێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ١٢٣﴾ واتە: ئەوەی شوێن بەرنامەکەم بکەوێت، نە گومڕا دەبێت، نە ناخۆشی و ناڕەحەتی و ناسۆر دێتە ڕێی.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ٥٧﴾ يونس: ٥٧ واتە: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی ئێوە ئامۆژگاریەکی گەورە و گرنگتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە (قورئانە)، شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەر و ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران.

ئیبنولقەییم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (القُرآنُ هو الشِّفَاءُ التَّامُّ من جميع الأَدْوَاء القَلبيَّة والبَدنيَّة، وَأَدْوَاءُ الدُّنيَا والآخِرَة)[1]، واتە: قورئان چارەسەری تەواوەتیە بۆ هەموو نەخوشیەکانی دڵ و لاشە، وە چارەسەری نەخۆشیەکانی دونیا و دوارۆژیشە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ١٢١﴾ البقرة: ١٢١ واتە: دەستەیەك لەوانەی کتێبمان پێ بەخشیبوون (قورئان) بە چاکی و بەوردی دەوری دەکەنەوە، ئەوانە باوەڕیان پێی هەیە و باوەڕی پێ دەهێنن.

بۆیە دەورکردنەوەی قورئان بە چاکی بە خوێندنەوە و لەبەرکردن و تێگەیشتن و

[1] زاد المعاد (١١٩/٤).

کارپێکردن دەبێت، کە هاوەڵان و تابیعیەکان هەر بەو شێوەیە ڕاڤەی ئەو ئایەتە دەکەن.

ئیبن مەسعود (رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ) دەفەرموێت: (كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا؛ إِذا تَعلَّمَ عَشْرَ آيَاتٍ لَمْ يُجَاوِزْهُنَّ حَتَّى يَعْرِفَ مَعَانِيهِنَّ والْعَمَلَ بِهِنَّ)[1]، واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێمە دە ئایەت لە قورئانی پیرۆز فێربوایە تێینەدەپەڕانـد تـاوەکو بەتەواوی لە مانـاکەی تێنەگەیشتایە و کاری پێ نەکردایە.

هەر بۆیە خوێندنەوەی قورئان بەبێ تێگەیشتن لە مانای و کـارکردن بەوەی کە تێیـدا هـاتووە بەدەورکـردنەوەی چـاك ناژمێردرێـت، هەر لەبەر ئەوە فـوزەیلی کوڕی عیاز (رَحِمَهُٱللَّهُ) دەفەرموێت: (إنّما نَزَلَ القرآنُ ليُعْمَلَ به، فاتَّخَـذَ النَّـاسُ قِرَاءَتُه عَمَلاً)[2]، واتە: قورئانی پیرۆز بۆ ئەوە دابەزیوە کاری پێ بکرێـت، بەڵام خەڵکی تەنها خوێنەدنەوەی قورئان بە کردەوە ئەزانن.

هەر بۆیە ئەگەر خوای گەورە خوێندنەوەی قورئان و تێگەیشتن لێی و کۆشش کردن بۆ کارکردن بە قورئان ببەخشێتە بەندەکەی ئەوە ئەو کەسە پشکی شێری لە پاککردنەوەی دەروون بەرکەوتووە.

---

[1] ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٣٤٨٢).

[2] ئاجوری لە (أخلاق حملة القرآن)ـدا ڕیوایەتی کردووە (لا٤١).

## بنەمای چوارەم:

# دانانی سەرمەشق و ڕابەر

خوای پەروەردگـار دەفەرموێـت: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ٢١﴾ الأحزاب: ٢١ واتە: سوێند بەخوا بەڕاسـتی لە پێغەمبەری خوادا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) چاكترین نموونەی تەواو ڕێكوپێك هەیە تا چاوی لێ بـكەن و شـوێنی بـكەون، بەتـایبەت بـۆ ئەو كەسـانەی ڕەزامەنـدی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە هەمیشە و بەردەوام یـادی خـوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بە یادی ئەو.

ئیبن كەسیر (رَحِمَهُٱللَّهُ) دەفەرموێت: (هذه الآيَة الْكَرِيمَة أَصْلٌ كَبِيرٌ فِي التَّأَسِّـي بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) فِي أَقْوَالِهِ وَأَفْعَالِـهِ وَأَحْوَالِـهِ)[١]، واتە: ئەم ئـایەتە پیرۆزە بنچینەیەكی مەزنە لە بەسەرمەشق دانانی پێغەمـبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) لە وتە و كردەوە و ڕەوشی ژیانی.

حەسەن (رَحِمَهُٱللَّهُ) دەفەرموێت: (قَـالَ قَـوْمٌ عَلَـى النَّبِـيِّ (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ): إِنَّـا نُحِبُّ رَبَّنا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعـالَى هـذِهِ الآيَـة: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ٣١﴾ آل عمـران: ٣١)[٢]، واتە: كـۆمەڵە كەسـێك لەسـەردەمی پێغەمـبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) وتیـان: ئـێمە خوامـان خۆشـدەوێت، خـوای گەورەش ئەم ئـایەتەی دابەزانـد: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ٣١﴾، واتە: (ئەی

---

[١] تفسير ابن كثير (٣٢٢/١١).

[٢] تەبەری لە تەفسیرەكەیدا ڕیوایەتی كردووە (٣٢٢/٦).

پێغەمـبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە ئیمانـداران) بڵـێ: ئەگەر ئێـوە خواتـان خـۆش دەوێت دە شوێنی مـن بـکەون و لەفەرمـانی مـن دەرمەچـن، ئەوکـاتە خـواش ئێوەی خۆش دەوێت.

هەر بۆیە شوێنکەوتن و بەسەرمەشقکردنی پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەڵـگەیە لەسـەر ڕاسـتگۆیی بەنـدە لە خۆشەویسـتی خـوای پەروەردگـار، چـونکە شوێنکەوتن و شوێن پێ هەڵگرتنـی پێغەمـبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و کـارکردن بە بەرنامە بەپێـزەکەی ئەو پـاککردنەوەی دەروونە، هەروەهـا ناگەیـت بەو پـلەیە ئەگەر شوێن بەرنامەی پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەکەویت.

هەروەها لە هەموو سەردەمێکدا کۆمەڵێـك پێشـەوای گـومڕاکەر دەردەکەون و ڕێگایەکی ناشرین و چەوت فێری خەڵکی دەکەن؛ دەڵـێن گـوایە ئەم ڕێگایـانە دڵ و دەروون پاك دەکەنەوە و پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورە بەهێز دەکات، وە هەندی قسەی تری هاوشێوە کە دەوترێت، هەروەها ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن بۆ دابڕان لە کۆمەڵگا و خەڵـوەتکردن لە شـوێنە تاریکەکەکانـدا، وە وتـنەوەی هەندێك وێردی تایبەت و هەندێ وشەی دیاریکراو، وە خەڵکی وا تێدەگەیەنن کە ئەم جـۆرە کـارانە دڵ و دەروون پـاك و پەروەردە دەکـات، هەروەهـا شـتی تریش لەو وتە پووچ و باتڵانە.

زانای پایەبەرز ئیبنولقەییم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (تَزْكِيَةُ النُّفُوسِ أَصْعَبُ مِـنْ عِلَاجِ الْأَبْدَانِ وَأَشَدُّ، فَمَنْ زَكَى نَفْسَهُ بِالرِّيَاضَةِ وَالْمُجَاهَـدَةِ وَالْخَلْـوَةِ الَّتِـي لَـمْ يُجِئْ بِهَا الرُّسُلُ فَهُوَ كَالمَرِيضِ الَّذِي يُعَالِجُ نَفْسَـهُ بِرَأْيِـهِ، وَأَيْـنَ يَقَـعُ رَأْيُـهُ مِـنْ

مَعْرِفَةِ الطَّبِيبِ؟! فَالرُّسُلُ أَطِبَّاءُ الْقُلُوب فَلَا سَبِيلَ إِلَى تَزْكِيَتِهَا وَصَلَاحِهَا إِلَّا مِنْ طَرِيقِهِم وَعَلَى أَيْدِيهِمْ وَبِمَحْضِ الْإِنْقِيَادِ وَالتَّسْلِيمِ لَهُمْ، وَاللَّهُ الْمُسْتَعَان)[١]، واته: پاككردنەوەی دەروون زۆر ئەستەمترە لە چارەسەری جەستە، هەر بۆیە هەركەسێك بیەوێت دەروونی پاك بكاتە بە هەوڵ و كۆشش و خەڵوەتكردنێك كە لە لایەن پێغەمبەرانەوە نەهاتبێت و بەرنامەڕێژی بۆ نەكرابێت ئەوە وەكو نەخۆشێك وایە كە چارەسەری خۆی بە بكات بەڕای خۆی بە بێ گەڕانەوە بۆ لای پزیشك، و ڕای ئەم كەسە لە كوێی زانست و زانیاریەكانی پزیشكدا جێی دەبێتەوە ؟! هەر بۆیە پێغەمبەران پزیشكی دڵانن، هەر بۆیە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ چاكسازی و پاكسازی دڵان تەنها ڕێگەی پێغەمبەران نەبێت و تەنها لە دەستی ئەوان دەبێت، وە بەوپەڕی گوێڕایەڵی و ملكەچی بۆیان دەبێت، پەروەردگاریش پشتیوان بێت.

هەروەها هەموو كردەوەیەك كە فەرمانی پێغەمبەری (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر نەبێت ڕەتدەكرێتەوە بۆ خاوەنەكەی، هەروەك سەروەرمان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (مَن عَمِلَ عَمَلًا ليسَ عليه أمْرُنا فَهو رَدٌّ)[٢]، واتە: هەركەسێك كارێك ئەنجام بدات كە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەتدەكرێتەوە. واتە: دەدرێتەوە بەسەری خاوەنەكەیدا.

ئیمامی سوفیانی كوڕی عویەینە (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەفەرموێت: (إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ

---

[١] مدارج السالكين (٢/٣٠٠).

[٢] ئیمامی موسلیم لە سەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (١٧١٨).

(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هُوَ المِيزانُ الأَكْبَر، فَعَلَيْهِ تُعْرَضُ الأَشْيَاء، عَلَى خُلُقِهِ وَسِيرَتِهِ وَهَدْيِه، فَمَا وَافَقَهَا فَهُوَ الْحَقُّ، وَمَا خَالَفَهَا فَهُوَ الْبَاطِلُ)[1]، واته: پێغەمبەری خوا (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مەزنترین پێوەرە، هەر بۆیە لە هەموو شتێکدا دەگەڕێینەوە بۆ خوڕەوشت و ژیان و بەرنامەکەی، هەر شتێك لەگەڵی هاوتابوو ئەوە حەق و ڕاستییە، وە هەر شتێکیش پێچەوانەبوو ئەوە پووچ و باتڵە.

هەر بۆیە پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە بیەوێت دەروونی پاك بکاتەوە کەوا کۆشش بکات بۆ شوێنکەوتن و بەسەرمەشقکردنی پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، هەروەها ئاگادار بێت لەو ڕێچکە و ڕێبازە داهێنراو و دروستکراوانەی کە داهێنەرەکانیان بانگەوازی ئەوەی بۆ دەکەن گوایە ئەوە ڕێگای پاککردنەوەی دەروونە.

[1] خەتیب لە پێشەکی کتێبەکەی (الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع)ـدا ڕیوایەتی کردووە (٧٩/١).

### بنەمای پێنجەم:

## وازهێنان لە تاوان (تخلية)
## جوان كردن بەڕوشتی بەرز (تحلية)

ڕاستی و دروستی پاككردنەوەی دەروون ئەوەیە: یەكەمجار دەروونمان بەتاڵ بكەینەوە و پاكی بكەینەوە لە هەموو تاوان و سەرپێچی و بەدكاریەك (تخلیة)، پاشان جوانی بكەینەوە بە عیبادەت و كاروكردەوەی چاك (تحلیة)، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ ١٠٣﴾ التوبة: ١٠٣ واتە: لە هەندێ ماڵ و سامانی ئەو (ئیمانداارانە) زەكات و خێر وەربگرە چونكە دەبێتە هۆی خاوێنكردنەوەی ماڵەكانیان و پاككردنەوەی دڵ و دەروونیان، وە دوعای دابارینی ڕەحمەت بكە بەسەریاندا و ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بكە.

لەو فەرمایشتەی پەروەردگار كە دەفەرموێت: ﴿تُطَهِّرُهُمۡ﴾ ئاماژەیەكی تێدایە بۆ پلەوپایەی (تخلیة) وازهێنان لە تاوان و خۆ پاككردنەوە لە گوناهـ، هەروەها ئەو فەرمایشتەش كە دەفەرموێت: ﴿وَتُزَكِّيهِم﴾ ئاماژەی تێدایە بۆ پلەوپایەی (تحلیة) خۆ جوانكردن بەڕەوشتی بەرز و كردەوەی چاك، هەروەها هێنانی وشەی ﴿تُطَهِّرُهُمۡ﴾ لە پێش وشەی ﴿وَتُزَكِّيهِم﴾ بەڵگەیە لەسەر وازهێنان لە تاوان (تخلیة) پێش خۆ جوانكردن بەڕەوشتی بەرز (تحلیة).

بۆیە بەدڵنیایی هەر كەسێك بیەوێت دەروونی پاك بكاتەوە پێویستە وازبهێنێت لەو تاوان و سەرپێچیانەی كە دڵ نەخۆش دەكات، هەروەها ڕووناكیی

هیـدایەت و ئیمـانی لـێ دەشـارێتەوە، هەروەکـو پێغەمـبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (إِنَّ العَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَـةٌ سَـوْداءُ، فَـإِذَا هُـوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُـوَ قَلْبَـهُ، وَهُـوَ الـرَّانُ الَّــذِي ذَكَــرَ اللَّـــهُ: ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤﴾ المطففين: ١٤)[١]، واتە: بەڕاستی کاتێ بەندە تاوانێك ئەنجام دەدات خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی دروست دەبێت، ئەگەر تەوبە بکات و داوای لێخۆش بوون بکـات ئەوە خـاڵە رەشـەکە دەسڕێتەوە و نامێنێت، بەڵام ئەگەر دووبـارە بگەڕێـتەوە سـەر تـاوان ئەو خـاڵە ڕەشە زیاد دەکات تاوەکو دڵی داگیـر دەکـات، ئەمەش هەر ئەو (ران)ــەیە کە خوای گەورە لە قەرئاندا باسـی دەکـات کە دەفەرموێـت: ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤﴾ المطففين: ١٤، واتە: نەخێـر، وانیــیە (ئەو نەفامـانەی تێنـاگەن و دانـاچڵەکێن)، بەڵکـو دڵیـان ژەنگـی هێنـاوە و چڵکـی گوناهــ داپۆشـیوە لە سەرەنجامی ئەو کار و کردەوانەی دەیانکرد.

پاشان کۆشش دەکات بۆ زۆرکردنی ئەو کاروکردەوە چاکانەی کە دەروونی پێ پاك دەبێتەوە، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩﴾ العنكبوت: ٦٩ واتە: ئەوانەی لە پێناوی ئـێمەدا و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکـی

---

[١] ترمذي لە (الجامع)ـدا ڕیوایەتی کردووە بە ژمـارە (٣٣٣٤)، هەروەهـا شـێخ ئەلبـانی بە حەسـەنی دانـاوە لە (صـحيح الترغيب والترهيب) (٢/٢٦٨).

چاك و دروست (كە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمەی لەدوایە)، بێگومان خوای گەورە هەمیشە لەگەڵ چاكەكارانە.

ئیبن تەیمییە (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (فَالتَّزْكِيَة وَإِنْ كَانَ أَصْلها النَّمَاءُ وَالْبركَةُ وَزِيَادَةُ الْخَيْرِ، فَإِنَّمَا تُحْصَلُ بِإِزَالَةِ الشَّرِّ، فَلِهَذَا صَارَ التَّزَكِّي يَجْمَعُ هَذَا وَهَذَا)[1]، واتە: هەرچەندە تەزكیە و پاككردنەوەی دەروون لە بنچینە بە مانای گەشەكردن و بەرەكەت و خێروچاكەی زۆرە، بەڵام بە لابردنی شەڕ و خراپەكاری بە دەست دێت، هەر بۆیە تەزكیە و پاككردنەوەی دەروون كۆكەرەوەی هەردوو لایەنەكەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾﴾ النساء: ٤٩، واتە: بەڵكو خوا (بەندەكانی دەناسێت) و هەركەس (شایستە بێت، پەسەندی دەكات) و دڵ و دەروونی خاوێن دەكات. ئیبن سەعدی لە تەفسیر و ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (أَيْ: بِالْإِيمَانِ وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ؛ بِالتَّخَلِّي عَنْ الأَخْلَاقِ الرَّذِيلَةِ، والتَّحَلِّي بِالصِّفَاتِ الجَمِيلَةِ)[2]، واتە: خوای گەورە دڵ و دەروونی بەندەكەی پاك دەكاتەوە بە ئیمان و كردەوەی چاك، هەروەها وازهێنان لە رەوشتی ناشیرین و خۆ جوانكردن بە ڕەوشتی بەرز.

---

[1] مجموع الفتاوى (٩٧/١٠).

[2] تيسير كريم الرحمن (لا١٨٢).

## بنەمای شەشەم:

## داخستنی ئەو دەروازانەی کە مرۆڤ لادەدات لە پاککردنەوەی دەروونی و دووری دەخاتەوە لە چاکەکاری و تووشی بەدکاریی دەکات

بەندەکان زۆر پێویستیان بەوەیە کە ئەو دەروازانە دابخەن کە دەروونیان پیس دەکات و بەرەو خراپەکاریان دەبات، لە سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نموونەمان بۆ هێنراوەتەوە کە مەترسی ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بەندە دەکەوێتە ناو هەندێك بابەتەوە کە دینەکەی لێ بزر دەکات، هەروەك لە فەرموودەیەکدا سەروەرمان (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (ضَرَبَ اللَّهُ تَعَالَى مَثَلًا صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا، وَعَلَى جَنْبَتَيِ الصِّراطِ سُوران، فِيهِمَا أَبْوابٌ مُفَتَّحَةٌ، وَعَلَى الْأَبْوَابِ سُتُورٌ مُرْخَاةٌ، وَعَلَى بَابِ الصِّراطِ داعٍ يقولُ: يَا أَيُّها النَّاسُ! ادْخُلُوا الصِّرَاطَ جَمِيعًا وَلَا تَتَعَوَّجُوا، وَدَاعٍ يَدْعُو مِنْ فَوْقِ الصِّراطِ، فَإِذَا أَرَادَ الْإِنسَانُ أَنْ يَفْتَحَ شَيْئًا مِنْ تِلْكَ الأَبْوابِ قَالَ: وَيْحَكَ لَا تَفْتَحْهُ، فإِنَّكَ إِنْ تَفْتَحْهُ تَلِجْهُ، فَالصِّراطُ الإِسلامُ، والسُّورانِ حُدُودُ اللَّهِ، وَالْأَبْوَابُ الْمُفَتَّحَةُ مَحَارِمُ اللَّهِ تَعَالَى، وَذلِكَ الدَّاعِي عَلَى رَأْسِ الصِّراطِ كِتَابُ اللَّهِ، وَالدَّاعِي مِنْ فوقٍ وَاعِظُ اللَّهِ فِي قَلْبِ كُلِّ مُسْلِمٍ)[1]، واتە: خوای گەورە نموونەی ڕێگایەکی ڕاستمان بۆ دەهێنێتەوە کە لە هەردوو لای ئەم ڕێگایە دوو دیواری لێیە، دوو دەرگای کراوە لە دیوارەکان هەیە، دەرگاکانیش پەردەیان لەسەرە کە ئەودیوی دیوارەکە

---

[1] ئیمامی ئەحمەد لە (المسند) دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١٧٩٠٩).

نابینرێت، لەسەر دەرگـای ڕێگـاکە بـانگکەرێکی لێـیە دەڵێـت: ئەی خەڵکیـنە هەمووتان لەسەر ئەم ڕێگـا ڕاسـتە بـڕۆن و بەمـلا و بەولادا مەچـن، هەروەهـا بانگکەرێکی تر لە سەر ڕێگاکەیە کە هەر کەسێك بیەوێت یەکێك لەو دەرگایانە بکاتەوە پێی دەڵێت: ئاگاداربە مەیکەرەوە، چـونکە ئەگەر بیکەیـتەوە زاڵنابیـت بەسـەر خۆتـدا و دەچیـتە ژوورەوە، ئەو ڕێگـایە ئیسـلامە، دوو دیـوارەکەش سنورەکانی خوای پەروەردگارە، دەرگاکانیش ئەوشتانەیە خوا حەرامی کردووە، ئەو بانگکەرەش کە لەسـەر دەرگـای ڕێگـاکەیە قورئـانە، ئەو بـانگکەرەش کە لەسەر ڕێگاکەیە ئامۆژگاری خوایە لە دڵی هەموو موسڵمانێکدا.

حافز ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی دەفەرموێت: (وَمَنْ كَانَ فِي الدُّنْيَا قَدْ خَرَجَ عَنْ الإِسْتِقَامَةِ عَلَى الصِّرَاطِ، فَفَتَحَ أَبْوَابَ المَحَارِمِ الَّتِي فِي ُستُورِ الصِّراط يُمْنَةً وَيُسْرَةً، وَدَخَلَ إِلَيْهَا - سَوَاءً كَانَتْ المَحَارِمُ مِنْ الشَّهَوَاتِ أَوْ مِنْ الشُّبُهَات - أَخَذَتْهُ الْكَلَالِيبُ الَّتِي عَلَى ذَلِكَ الصِّرَاطِ يُمْنَةً وَيُسْرَةً، بِحَسَبِ مَا فَتَحَ فِي الدُّنْيَا مِنْ أَبْوَابِ المَحَارِمِ وَدَخَلَ إِلَيْهَا)[1]، واتە: هەرکەسێك لە دونیادا لەسەر ڕێگای ڕاست لابدات، ئەوە دەرگای حەرامەکان لە خۆی دەکاتەوە کە لە ڕاست و چەپی ڕێگاکەن، پاشان دەچێتە ژوورەوە لە دەرگاکە - جا ئەو دەرگای حەرامە هەوا و ئارەزوو (شهوات) بێت یاخود شتە ناڕوونەکان (شبهات) بێت - پاشان ئەو دڕك و دالانەی لەسەر ڕاست و چەپی ڕێگاکەن ڕایاندەکێشێت بەرەو خراپە، بەپێی ئەو دەگای حەرمەی کە دەیکاتەوە و لێی دەچێتە ژوورەوە.

---

[1] مجموع رسائل ابن رجب (١/٢٠٦).

هەروەهــا خــوای گەورە دەفەرموێــت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ النور: ٣٠، واتە: ئەی پێغەمــبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە پیاوانی ئیمانـدار بڵـێ: چاویـان بپـارێزن (لەسـەرنجدانی ئافرەتی نامەحرەم)، هەروەها ناموس و عەورەتـی خۆیـان لە حەرام بپـارێزن، بێگومـان ئەوە پـاکتر و پـوختترە بۆیـان (بـۆ دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ڕۆح و لاشەیان)، بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەی کە دەیکەن.

ئەبو حەییانی ئەندەلوسی دەفەرموێت: (قُدِّم غُضُّ البَصَرِ عَلَى حِفْظِ الْفَـرْجِ لأنَّ النَّظَرَ بَرِيدُ الزِّنَا وَرَائِدُ الْفُجُورِ، وَالبَلْوَى فِيهِ أَشَدُّ وَأَكْثَـر)[١]، واتە: لەم ئـایەتەدا نەزەر خراوەتە پێش پاراستنی داوێن، چـونکە نەزەرکـردن ئەتبـا بەرەو داوێـن پیسی، کارەسات لێرە گەورەترە.

شێخ سەعدی (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەفەرموێت: (فإنَّ مَنْ حَفظَ فَرْجَهُ وَبَصَـرهُ، طَهُـرَ مِـنْ الخَبَثَ الَّذي يَتَدَنَّسُ بِهِ أَهْلُ الْفَوَاحِشِ، وَزَكَـتْ أَعْمَالُـهُ بِسَبَبِ تَـرْكِ الْمُحَـرَّمِ، الَّذي تَطْمَعُ إِلَيْهِ النَّفْسُ وَتَدْعُو إِلَيْه، فَمَنْ تَرَكَ شَيْئاً لِلَّهِ عَوَّضَهُ اللَّهُ خَيْراً مِنْهُ)[٢]، واتە: هەر کەسێك دامێن و چاوی لە حەرام بپارێزێـت، ئەوە لەو پیسـیانە پـاك دەبێتەوە کە کەسانی تاوانبار پێی پیس دەبن، هەروەها کردەوەشی جوان دەبێت بەهـۆی وازهێنـان لە کـردەوەی حەرام، ئەو کـردەوانەی کە نەفـس و دەروون ئـارەزووی لێـیە و داوای دەکـات، هەر کەسـێك لەبەر خـوای گەورە واز لە

[١] (البحر المحيط) لأبي حيان الأندلسي (٣٣/٨).
[٢] تيسير الكريم الرحمن (٦٦٠/١).

کردەوەیەکـی خـراپ بهێنێـت، ئەوە خـوای گەورە بە باشـتر بـۆی قەرەبـوو دەکاتەوە.

هەر بۆیە یەکێك لەو شتانەی دینی مرۆڤ جوان دەکات ئەوەیە کە واز لە شتێك بهێنێت کە پەیوەندی بەوەوە نییە، لە قسەی زیادە و نەزەرکردن و شتی تر.

ئیبنولقەییم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (وَأَكْثَرُ المَعَاصِي إِنَّمَا تَوَلُّدُهَا مِنْ فُضُولِ الكَلَامِ وَالنَّظَرِ وَهُمَا أَوْسَع مَدَاخِلِ الشَّيْطَانِ، فَإِنْ جَارَحْتِيهما لَا يَمُلَّان وَلَا يَسْأَمَان)[1]، واتە: زۆرترینی تاوانەکان بەهۆی قسەی زیادە و نەزەرەوە دروست دەبن، ئەو دووانەش فراوانترین دەروازەی هاتنە ژوورەوەی شـەیتانە، ئەو دوو ئەندامەش لەوانەن کە نە بێزار دەبن نە وەڕس دەبن.

بۆیە پێویستە لەسەر بەندە زرنگ و دانـا بێـت و داوای ئـارامی و ڕزگـاری لە خوای گەورە بکات، هەروەها هەموو ئەو ڕێگایانە ببڕێت کە بەرەو لەناوچوون و خراپەکاری دەبـات، چـونکە دینـی بەنـدە سـەرمایەکەیەتی، بەلەنـاوچوونی دینەکەی واتە دۆڕانی لە دونیا و دواڕۆژدا، بە تـایبەتی لەم سـەردەمەی ئـێمەدا کە فیتـنە وەکـو بـاران بەسـەر خەڵکیـدا دەبارێـت، هەروەهـا هەمـوو جـۆرە دەرگـایەکی هەوا و ئـارەزوو کـراوەیە لەگەڵ ئەم ئـامێرە سـەردەمیانە و سـایتە گومانلێکراوەکـان و بەرنـامە گومڕاکەرەکـان، کە خەڵیـان بەرەو سەرلێشـێوان بـردووە و لە ڕێگـای هیـدایەت لایانـداون، - تکامـان وایە خـوای گەورە سەلامەتمان بکات -.

---

[1] بدائع الفوائد (٢/٨٢٠).

## بنەمای حەوتەم:

## یادکردنەوەی مردن و دیدەنی پەروەردگار

خــوای گەورە دەفەرموێــت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨﴾ الحشـر: ١٨، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتـــان هێناوە، خواناس و پارێزکاربن، لە سنورەکانی خوا مەترازێن، با هەمـوو کەس سەرنج بدات و بزانێت چی بۆ سبەی دەست پێشخەری کردووە.

هەروەهـــــــا پێغەمــــــــــبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێـــــــــــت: (أَكْثِرُوا من ذِكْرِ هادمِ اللَّذَّاتِ)[1]، واتە: زۆر یادی لەناوبەری چێژەکان بـکەن. واتە مردن.

مردن جیاکەرەوەی نێوان دونیا و دواڕۆژە، هەروەها ناوبڕە لە نێوان کاتی کار و پاداشت، هەروەها سنوری جیاکەرەوەی نێوان کارکردن و وەرگرتنـی پاداشـتە، هەر بـۆیە هــیچ بـواری تەوبە و پەشـیمانی و داوای لێخۆشـبوون لە کـردەوە خراپەکانی تێدا نییە، بە هەمان شێوە بوار نییە بۆ کردنی کار و کردەوەی چاك، هەروەك خـوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ ١٨﴾ النســــــــــاء: ١٨، واتە: تەوبە و پەشیمانی بۆ ئەو کەسانە نییە کە بەردەوامـن لەسـەر گوناهــ و تـاوان، کە ئەو کاتەی مردن یەخەی بە یەکێکیان گرت ئەوسا بڵێت: ئەوە ئیتر من بەڕاسـتی لە ئێستاوە تەوبەم کرد.

[1] ئیبن ماجە ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٢٥٨)، شێخ ئەلبانی لە (الإرواء)دا دەفەرموێت سەحیحە (١٤٥/٣).

هەروەها مردن هەموو کەسێك دەگرێتەوە بێ جیاوازی و بێگومان، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنۡهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ ۝٨﴾ الجمعة: ٨ واتە: ئەی پێغەمبەر (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) پێیان بڵێ: بەڕاستی ئەو مردنەی کە ڕادەکەن لە دەستی هەر یەخەتان دەگرێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖۗ ۝٧٨﴾ النساء:٧٨، واتە: (دڵنیابن) لەهەر کوێ بن مردن یەخەتان پێ دەگرێت، با لەناو چەندین قەڵا و شوێنی سەخت و قایمیشدا بن.

لەگەڵ ئەوەشدا مردن لەناکاو یەخەی مرۆڤ دەگرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ۝٣٤﴾ الأعراف: ٣٤، واتە: جا کاتێك کۆتایی تەمەنیان هات، ئەوە نە تاوێك دوا دەکەون نە تاوێکیش پێش دەکەون.

چەند کەسمان بینی لە ماڵەکەی دەردەچێت بەئۆتۆمبێلەکەی و کەچی بە کفنەوە و لەسەر شان دەیگەڕێننەوە بۆ ماڵەکەی، هەروەها چەندین مرۆڤ بە کەسوکارەکەی وت: خواردنم بۆ ئامادە بکەن، بەڵام مرد و لێی نەخوارد، بەهەمان شێوە چەندین مرۆڤ جل و بەرگی پۆشی و قۆپچەکانی داخست بەڵام مردوو شۆر قۆپچەکانی کردەوە.

هەر بۆیە لە یادکردنەوەی مردن دا سوودی مەزنی هەیە بۆ بەندەکان، چونکە بە یادکردنەوەی مردن دڵە بێ ئاگاکان بە خەبەر دێنەوە و دڵە مردووەکانیش زیندوو دەبنەوە، بەندەش بە جوانی ڕوو لە خوای خۆی دەکات و هەروەها بێ

ئاگایی و پشت کردن لە عیبادەتی خوای گەورە ناهێڵێت.

سەعیدی کوڕی جوبەیر (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (لَوْ فَارَقَ ذِكْرُ الْمَوْتِ قَلْبِي خَشِيتُ أَنْ يَفْسُدَ عَلَيَّ قَلْبِي)[١]، واتە: ئەگەر یادی مردن لە دڵم جیابێتەوە ترسی ئەوەم هەیە دڵم بەرەو خراپە بمبات.

هەر بۆیە بەندە بەردەوام لە خێردایە تا ئەوکاتەی کە ئاگای لە بارودۆخی خۆی دەبێت لە بەردەستی پەروەردگاری لە دوارۆژدا و دوای مردنی، و هەروەها ئاگای لە چارەنوسی بێت لە دوای مردن.

سوفیانی کوڕی عویەینە (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: ئیبراهیمی تەمیمی (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (مَثَّلْتُ نَفْسِي فِي الْجَنَّةِ آكلُ ثمَارَهَا، وَأَشْرَبُ مِنْ أَنْهَارِهَا، وَأُعَانِقُ أَبْكَارَهَا، ثُمَّ مَثَّلْتُ نَفْسِي فِي النَّارِ آكلُ مِنْ زَقُّومِهَا، وَأَشْرَبُ مِنْ صَدِيدِهَا، وَأُعَالِجُ سَلَاسِلَهَا وَأَغْلَالَهَا؛ فَقُلْتُ لِنَفْسِي: أَيْ نَفْسِي! أَيُّ شَيْءٍ تُرِيدِينَ؟ قَالَتْ: أُرِيدُ أَنْ أُرَدَّ إِلَى الدُّنْيَا فَأَعْمَلَ صَالِحاً، قَال: قُلْتُ: فَأَنْتَ فِي الأُمْنِيَةِ فَاعْمَلِي)[٢]، واتە: وابیرم کردەوە لەبەهەشتدا بم، لە بەروبوومەکانی دەخۆم و لە ڕووبارەکانی دەخۆمەوە، باوەش بە حۆریەکاندا دەکەم، پاشان وا بیرم کردەوە لە ئاگردام، لە تاڵ و ژەهرەکەی دەخۆم و لە کێمەکانی دەخۆمەوە، هەروەها هەوڵی خۆ ڕزگارکردن دەدەم لە کۆت و بەندەکانی، پاشان بەنەفسی خۆمم وت: ئەی نەفسم! چیت دەوێ؟ وتی: ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ دونیا و کردەوەی چاك

[١] ئیمامی ئەحمەد لە (الزهد) دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٢١٠).

[٢] ئیبن ئەبی دونیا لە (محاسبة النفس)ـدا گێراویەتیەوە (لا٢٦).

بکەم، فەرمووی: وتم: دەی تۆ ئێستا لەو بارەدای کە دەتەوێ، دەی ئیش بکە.

هەروەها تـۆ بەنەفسـی خـۆت بڵـێ: ئەی نەفسـم! ئەگەر مـن مـردم ئیتـر کـێ لەجیاتی من نوێژ دەکات، ئەی کێ لەجیاتی من ڕۆژوو دەگرێـت، ئەی کـێ لە جیاتی من تەوبە ئەکات لە تاوان و زیادەڕۆییەکانم ؟!

## بنەمای هەشتەم:

# هەڵبژاردنی هاوڕێ و دۆستی باش

خــوای گەورە دەفەرمویــت: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾﴾ الكهف: ٢٨، واتە: ئارام بگرە و خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەســانەدا کە خواپەرســتی دەکەن و یــادی پەروەردگاریــان ویــردی سەرزاریانە لەبەرەبەیان و دەمە و ئێواراندا، مەبەستیانە و دەیانەوێـت ئەو زاتە ڕازی بکەن، ڕوو لەوان وەرمەگێڕە و (ڕوو مەکە دونیا پەرستان و دەوڵەمەندان) لە کاتێکدا تۆ زینەت و ڕازاوەیی ژیـانی دونیـات بوێـت و بەگـوێی ئەو جـۆرە کەسـانە مەکە کە دڵیمـان غافـڵ کـردووە لە یـادی خۆمـان (بە هـۆی دونیـا پەرستیەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتـووە و هەرچـی کاروبـاری هەیە بـێ سەر و بنە و لە سنور دەرچووە.

سەعدی (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لە تەفسیر و ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (فِيهَـا الأَمْـرُ بِصُحْبَةِ الأَخْيَارِ وَمُجَاهَدَةِ النَّفْسِ عَلَى صُحْبَتِهِمْ وَمُخَالَطَتِهِمْ، وَإِنْ كَـانُوا فُقَـرَاء فَـإِنَّ فِـي صُـحْبَتِهِمْ مِـن الفَوَائِـدِ مـا لا يُحْصَـى)[١]، واتە: لەم ئـایەتە پیـرۆزەدا فەرمـانکراوە بە هـاوڕێیەتیکردنی کەسـانی بـاش، هەروەهـا هەوڵ بـدەن کە دۆستایەتیان بکەن و تێکەڵیان بن، هەرچەند ئەگەر هەژاریـش بـن، چـونکە لە دۆستایەتی کردنیاندا سوودی زۆر هەیە کە ناژمێردرێت.

[١] تيسير الكريم الرحمن (لا٥٤٧).

پێغەمبەر (صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ)[١]، واتە: پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، با هەریەکێك لە ئێوە بزانێت هاوڕێیەتی کێ دەکات.

ئەبو سولەیمانی خەتابی (رَحِمَهُٱللَّهُ) دەفەرموێت: (قَوْلُهُ: (الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ)، مَعْنَاهُ: لا تُخَالِلْ إلا مَنْ رَضِيتَ دِينَهُ وَأَمَانَتَهُ، فَإِنَّكَ إِذَا خَالَلْتَهُ قَادَكَ إِلَى دِينِهِ وَمَذْهَبِهِ، وَلا تُغَرِّرْ بِدِينِكَ، وَلا تُخَاطِرْ بِنَفْسِكَ، فَتُخَالِلْ مَنْ لَيْسَ مَرْضِيًّا فِي دِينِهِ وَمَذْهَبِهِ)[٢]، واتە: مانای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) کە دەفەرموێت: (الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ) ئەوەیە کە هاوڕێیەتی کەسێك مەکە ئەگەر لە دین و ئیمانی ڕازی نەبوویت، چونکە ئەگەر هاوڕێیەتی بکەیت ئەتبا بۆ دین و مەزهەبەکەی خۆی، تۆش دینەکەت مەدۆڕێنە لە پێناو هاوڕێیەتی کەسێك کە دین و مەزهەبی جێی ڕەزامەندی خوای گەورە نییە.

هەر لەبەر ئەمەش ئیبن مەسعود (رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ) دەفەرموێت: (اعْتَبِرُوا النَّاسَ بِأَخْدَانِهِمْ، فَإِنَّ الْمَرْءَ لَا يُخَادِنُ إِلاَّ مَنْ يُعْجِبُهُ)[٣]، واتە: کەسایەتی خەڵك بە هاوڕێ و دۆستەکانیاندا بناسنەوە، چونکە مرۆڤ هاوڕێیەتی کەسێك دەکات کە لای پەسەند بێت.

هەروەها پێغەمبەر (صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (مثَلُ الجلِيس الصَّالِح

---

[١] ئەبوداود لە (السنن)دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٨٣٣)، وە شێخ ئەلبانی لە (السلسلة الصحيحة)دا دەفەرموێت حەسەنە (٦٣٤/٢).

[٢] العزلة (لا٥٦).

[٣] ئیبن بەتە لە (الإبانه الكبرى)دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٧٦).

وَجَلِيسِ السُّوءِ: كَحَامِلِ المِسْكِ، وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحامِلُ المِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، ونَافِخُ الكِيرِ إِمَّا أَن يَحْرِقَ ثِيابَكَ، وإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا مُنْتِنَةً)[١]، واته: نموونەی هاوڕێی باش و خراپ وەكو بۆن فرۆش و ئاسنگەر وایە، چونكە بۆن فرۆش یان بۆنێكی خۆشت پێ دەدات، یان بۆنی خۆشی لێ دەكڕیت، یاخود بۆنی خۆی خۆشە، بەڵام ئاسنگەر یان جلەكانت دەسوتێنێت یاخود بۆنی ناخۆشە.

قازی عیاز (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت: (فِيهِ تَجَنُّبَ خُلَطَاءِ السُّوءِ وَمُجَالَسَةِ الأَشْرَارِ وَأَهْلِ البِدَعِ وَالمَغْتَابِينَ لِلنَّاسِ؛ لأَنَّ جَمِيعَ هؤُلَاءِ يَنْفَذُ أَثَرَهُمْ إِلَى جَلِيسِهِمْ، وَالْحَضُّ عَلَى مُجَالَسَةِ أَهْلِ الخَيْرِ وَتَلَقِّي العِلْمِ وَالأَدَبِ، وَحُسْنُ الهُدَى وَالأَخْلَاقُ الحَمِيدَة)[٢]، واتە: لەم فەرموودەیەدا فەرمان كراوە بە خۆ بەدوورگرتن لە تێكەڵبوون بە كەسانی خراپ و شەڕانگێز، هەروەها كەسانی بیدعەچی و هەروەها ئەو كەسانەش كە پاشەملە باسی خەڵك دەكەن و غەیبەت دەكەن، چونكە هەموو ئەو كەسانە كاریگەری لە شوێنی خۆیان جێدەهێلن، هەروەها هاندان بۆ هاوڕێیەتی كردنی كەسانی چاكەكار و چاكەخواز و وەرگرتنی زانست و هیدایەت و ڕەوشتی بەرزیش بە هەمان شێوە لەم فەرموودەیەدا هاتووە و فەرمانی پێ كراوە.

هەر بۆیە پێویستە بەندە هاوڕێ و دۆستێك هەڵبژێرێت كە هاوكاری بكەن لە

---

[١] ئیمامی بوخاری لە سەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٥٥٣٤)، ئیمامی موسلیم لە سەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٦٢٨).

[٢] إكمال المعلم بفوائد المسلم (١٠٨/٨).

کاری خێر و چاکەدا، چونکە ئەو کەسانە هۆکارن بۆ پاك بـوونەوەی دەروون، هەروەها ئاگاداربێـت لە هەڵبژاردنـی هـاوڕێی خـراپ و کەسـانی شـەڕانگێز، چونکە ئەوانە لە گەڕی ترسناکترن بۆ مرۆڤ.

## بنەمای نۆیەم:

# سڵکردنەوە لە شانازی بەخۆکردن و لەخۆبایی بوون

خـوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾ النجم: ٣٢، واتە: کەواتە خۆتان بە چاك مەزانن، خۆتان بە پاڵفتە دامەنێن، هەر خوا دەزانێت کێ تەقوای هەیە و کـێ پارێزکـارە. خـوای گەورە فەرمـانی کـردووە کە بەخۆمـان هەڵنەدەین و وەسفی خۆمـان نەکەیـن بە دڵ و دەروون پـاك، چـونکە تەقـوا و پارێزکاری شوێنی لە دڵدایە، تەنها خودا دەزانێت کە کـام دڵە لە پارێزکـارانە، هەر ئەو بەخۆداهەڵدانەش هۆکارێکە بۆ شانازی بەخۆکردن، هەروەها ئەوەش هۆکارێکە بۆ ڕیا و ڕوپامایی کردن کە ئەم کـردەوەیە کـار و کـردەوە چاکەکـان هەڵدەوەشێنێتەوە.

هەروەها ئیماندار هەرچەند کۆشش بکات و کـاروکردەوەی چـاك بکـات و لە حەرامکراوەکان خۆی بپارێزێت هێشتا هەر کەمـتەرخەمە و ستەمی لە خـۆی کـردووە، چـونکە ئەبـوبەکر (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُ) - کە ڕاسـتگۆی ئەم ئـوممەتە بـوو، هەروەهـا باشـترین کەسێك بـووە لە دوای پێغەمـبەران - کاتێـك پرسـیاری لە پێغەمـبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) کـرد کە فێـری نزایەکـی بکـات کە لە نوێژەکانیـدا بیکات، پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی بڵێ: (اللَّهـمَّ إِنِّـي ظَلَمْـتُ نَفْسِـي ظُلْمًا كثِيرًا، وَلا يَغْفِر الذُّنوبَ إلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِر لي مغْفِرَةً مِـن عِنْـدِكَ، وَارحَمْنـي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفور الـرَّحِيم)[١]، واتە: پەروەردگـارا مـن ستەمێکی زۆرم لە خـۆم

---

[١] ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا ڕیـوایەتی کـردووە بە ژمـارە (٨٣٤) ، ئیمـامی موسـلیم لە سـەحیحەکەیدا ڕیـوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٠٥).

کـردووه، و هـیچ کەسـێکیش لە تاوانەکـان خـۆش نابێـت تەنهـا تـۆ نەبێـت، هەرخۆتیش لێم ببورە و لێم خۆش بە، و بەزەییت پێمـدا بێـتەوە، بەڕاسـتی هەر خۆت لێخۆشبوو و بەبەزەییت. دەی دەبێت پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ ئـێمە چی بفەرموێت؟!

هەرروەهـا دایکـی ئیمانـداران عائیشـە (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهَا) کاتێـك پرسـیاری کـرد لە پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەربارەی ئەم فەرمایشـتەی خـوای گەورە: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ۝٦٠﴾ المؤمنون: ٦٠، واتە: ئەوانەش کە دەبەخشن لە زەکات و خێر دڵیان دەترسێت نەوەکو لێیان وەرنەگیرێت، چونکە ئەوانە بێگومانن کە بۆ لای پەروەردگاریـان دەگەڕێـنەوە. (قَالَـتْ: أَهُـم الَّـذِينَ يَشْرَبونَ الخَمْرَ ويَسْرقونَ؟ قَالَ (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَا يَا بِنْـتَ الصِّـدِّيق، وَلكـنَّهُمْ الَّذِين يَصُومُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَتَصَـدَّقُونَ وَهُـمْ يَخَـافُونَ أَلَّا تُقْبَـلَ مِـنْهُمْ)[١]. واتە: فەرمـووی: ئایـا ئەمـانە ئەو کەسـانەن کە عـارەق دەخـۆنەوە و دزی دەکەن؟ پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: نەخێر ئەی کچی سدیق، بەڵکـو ئەوانەن کە بەڕۆژوو دەبـن و نـوێژ دەکەن و خێـریش دەکەن، بەڵام دەترسـن لێیـان وەرنەگیرێت.

هەروەها عبداللەی کوڕی ئەبی مولەیکە (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (أَدْرَكْتُ أَكْثَرَ مِنْ ثَلَاثِينَ صَحَابِيًّا كُلُّهُمْ يَخَافُ النِّفَاقَ عَلَى نَفْسِهِ)[٢]، واتە: گەیشتم بە زیاتر لە سی هاوەڵ، هەموویان ترسیان لە دووڕوویی هەبوو.

---

[١] ئیمامی تیرمیزی لە (الجـامع) دا ڕیـوایەتی کـردووە بە ژمـارە (٣١٧٥) ، شـێخ ئەلبـانی لە (الصـحیحە)دا دەفەرموێـت سەحیحە بە ژمارە (١٦٢).

[٢] ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە بە فەرمودەیەکی موعەلەق پێش ژمارە (٨٣٤).

ئیمامی حەسەنی بەسری (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (إِنَّ الْمُؤْمِنَ جَمَعَ إِحْسَانًا وَشَفَقَةً، وَإِنَّ الْمُنَافِقَ جَمَعَ إِسَاءَةً وَأَمْنًا، ثُمَّ تَلَا الْحَسَنُ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ۝٥٧﴾ المؤمنون: ٥٧)[1]، واتە: ئیماندار چاکە و ترسی خوا لێ ڕەنجانی کۆکردۆتەوە، بەڵام دووڕوو خراپەکاری و بێ باکی کۆکردۆتەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ۝٥٧﴾، واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵدایە و دەترسن لێیان بڕەنجێت.

[1] ئیمامی تەبەری لە تەفسیرەکەی دا ڕیوایەتی کردووە (٦٨/١٧).

## بنەمای دەیەم:

# ناسینی دەروون

ئەوەی کە پێویستە لە بابەتی تەزکیە و پاککردنەوەی دەرووندا: زانینی حەقیقەتی ئەم دەروونە، هەروەها زانینی تایبەتمەندیەکانیەتی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی پەروەردە بکرێت و چاودێری بکرێت، وە هەروەها لەو کارەساتانەی کە دێنەڕێی بپارێزرێت.

خوای پەروەردگار لە قورئانە پیرۆزەکەیدا سێ جۆری بەناوبانگ و زانراوی نەفس و دەروون باس دەکات، کە بەپێی بارودۆخی نەفس و دەروونەکان ئەم سێ جۆرە دیاری کراوە، ئەویش ئەمانەن:

- **نەفسی ئارام و دڵنیا و دامەزراو (النفس المطمئنة):** ئەمەش ئەو نەفسەیە کە بە ئیمان و یادی خوا و عیبادەتکردن و ڕوو لە خوا کردن ئارام و دڵنیا بووەتەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ الرعد: ٢٨، واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگادار بنو دڵەکان: هەر بە قورئان و یادی خوا و (پابەند بوون بەئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ٣٠﴾ الفجر: ٢٧ - ٣٠، واتە: (شایانی

باسه به ئیماندارانی سـەرفراز لەسـەرەمەرگدا دەوترێـت): ئەی خـاوەنی دڵ و دەروونی پـڕ لە ئـارامی (ئەی ئـادەمیزادی ژیـر و هۆشـمەندی کە لە تەمەنـی کۆتایی دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست...)، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازییە، دە بچۆرە ڕیـزی بەنـدە چاکە نازدار و بەڕێزەکانمەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە.

- **نەفسی لۆمەکار و سەرزەنشـتکار (الـنفس اللوامـة):** ئەمەش ئەو نەفسەیە کە بەردەوام خـاوەنەکەی سەرزەنشـت دەکـات لەسـەر هەڵە، یـان لە کەمتەرخەمیەك لە ئەرکێکدا، یان لە زیادەڕۆیی کـردن لە عیبادەتـدا، هەروەکـو خوای گەورە لە سورەتی (القیامة) دا دەفەرمویـت: ﴿وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢﴾ القيامة: ٢، واتە: سوێند دەخۆم بە ویژدانی زینـدوو و نەفسـی ڕەخـنە لەخـۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات.

- **نەفسی فەرماندەر بە تاوان (النفس الأمارة بالسـوء):** ئەمەش ئەو نەفسەیە کە هانی خاوەنەکەی دەدات بۆ کردەوەی خراپ و ئەنجامدانی تاوان، هەروەها بەرەو شوێنی تاوان و خراپەکاری پەلکێشی دەکات، هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی یوسـفدا دەفەرمویـت: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣﴾ يوسف: ٥٣، واتە: (دەشێت یوسف یـان ژنەکەی عەزیزی میسر وتبێتی) منیش نەفسی خۆم بەری ناکەم، چونکە بەڕاستی نەفس (ئەگەر بەنووری خواناسی ئاوەدان نەبێت) زۆر فەرمانەدەرە بە گوناهـ و هەڵە و تاوان، مەگەر نەفسێك کە پەروەردگارم میهرەبانی پێ کردبێت.

ئەم سێ جۆرەی نەفس و دەروون پەیوەندی بە ڕاستی و حەقیقەتی نەفس و دەروونی کەسەکەوە هەیە، هەر لەبەر ئەوەشە ئەم بارودۆخانە گۆڕانکاری بەسەردا دێت بە پێی ئەو کاروکردەوانەی مرۆڤ ئەنجامی دەدات، لەوانەیە هەموو ئەم بارودۆخانە لەیەك مرۆڤدا کۆببێتەوە لە ڕۆژێکدا بە پێی بارودۆخی دەروون.

زانایان چەندین نموونەیان باس کردووە لە بارەی دەروونەوە کە بارودۆخی مرۆڤ لەگەڵ دەروون ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی مسوڵمان بە ئاسانی بتوانێت لێی تێبگات و ئەندێشەی بکات، تا بتوانێت دەروونی پاك و خاوێن بکاتەوە.

لێرەدا تەنها باسی دوو نموونە دەکەم کە نموونەی دوو ئیمامی بەرز و بەڕێزن:

**نموونەی یەکەم:** ئەم نموونەیە ئیمامی ئاجوڕی (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لە کتێبی (أدب النُّفوس) دا هێناویەتیەوە، دەفەرموێت: من نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە تاوەکو بابەتەکەت لا ڕوون بێت (إن شاء اللّه): بزانە کە دەروون وەکو ماینێکی چاك وایە لە ناو کۆمەڵە ئەسپێکدا، ئەگەر تەماشاکەر سەیری بکات جوانی و دڵڕفێنی سەرسامی دەکات، کەسانی شارەزاش لەبارەیەوە دەڵێن: (ئەمە سوودی لێ نابینرێت تاوەکو بە جوانی مەشقی پێ نەکرێت و بەجوانی پەروەردە نەکرێت، ئەوکاتە دەتوانی سوودی لێ ببینیت، ئەوکاتە بۆ ئیش و کار و غاردانیش دەشێت، سوارچاکەکەشی ستایشی ئەنجامی مەشق و پەروەردەکەی دەکات، بەڵام ئەگەر مەشقی پێ نەکرێت و پەروەردە نەکرێت، ئەوە جوانی و

دڵڕفێنیەکەی سوودی لێ نابینرێت، سوارچاکەکەشی ستایشی ئەنجامەکەی ناکات لەکاتی پێویستیدا).

هەر بۆیە ئەگەر خاوەنی ئەم ماینە گوێ بگرێت لە کەسانی شارەزا و ئەو کەسانەی ئامۆژگاری دەکەن، ئەوکاتە دەزانێت کە قسەی ئەم کەسانە ڕاستە، ئینجا بە دوای ڕاهێنەر و پەروەردەکارێکدا دەگەڕێت ڕاهێنانی پێ دەکات.

- پاشان دەبێت ئەو ڕاهێنەرە کەسێکی شارەزابێت لە ڕاهێنان، هەروەها لەگەڵیدا کەسێك بێت کە ئارام بگرێت لەگەڵ زانستی ڕاهێنان و ئامۆژگاری دەکات و سوود بەخاوەنەکەی دەگەیەنێت.

- بەڵام ئەگەر ڕاهێنەر زانیاری نەبێت لەسەر ڕاهێنان، هەروەها هیچ زانستێکی پەروەردەکردنی ئەسپی لا نەبێت ئەوکاتە ئەو ماینەش تێکدەدات و خۆشی هیلاك دەکات، سوارچاکەکەشی ستایشی ئەنجامەکەی ناکات.

- هەروەها ئەگەر ڕاهێنەر زانستی ڕاهێنان و پەروەردەی ئەسپی لابێت، بەڵام ئارام نەگرێت لەسەر قورسی و ناخۆشی ڕاهێنان و مەشقکردن، تەنها خۆشی خۆی مەبەست بوو، هەروەها تەمەڵی کرد لەو ئەرکەی لەسەرێتی لە ڕاهێنان و ئامۆژگاری، ئەوەش بەهەمان شێوە ماینەکە تێکدەدات و خراپەی لەگەڵ دەکات، هەروەها ئەو ماینەش بۆ پێویستی و غاردانیش ناگونجێت، هەروەها دەبووە خاوەنی جوانیی بێ ناوەڕۆك.

• بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی هەر خۆی ڕاهێنەرەکەی بێت: ئەوکاتە پەشیمان دەبێتەوە لە تەمەڵی کردنی لەڕۆژێکدا کە پەشیمانی سوودی نابێت بۆی، کاتێك کە سەیری کەسانی تر دەکات، دەبینێت کە ماینەکانیان لە کاتی پێویستی ئامادەن و لە کاتی غاردان سەلامەت دەبن، بەڵام ئەم لە کاتی پێویستدا ماینەکەی ئامادە نییە و لە غارداندا سەلامەت نابێت، هەموو ئەمانەش بەهۆی تەمەڵی کردنیەوە و ئارام نەگرتنی لەسەر ڕاهێنان و مەشقکردنە، پاشان دەست دەکات بە لۆمە و سەرزەنشتکردنی نەفس و دەروونی خۆی و دەڵێت: (بۆ زیادەڕۆیت کرد؟ بۆ کەمتەرخەمیت کرد؟ بە هۆی ئارام نەگرتن هەموو ئەو شتانەی ڕقم لێیەتی بەسەر خۆمدا هاتنەوە)، خواش پشتیوانە.

ژیربن (ڕەحمەتی خواتان لێ بێت)، لەم نموونەیەوە فێربن و کاری پێ بکەن ڕزگارتان دەبێت و سەرکەوتوو دەبن .

ئەمە نموونەی یەکەمە کە ئیمامی ئاجوڕی (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) تێیدا بارودۆخ و جۆرەکانی نەفس و دەروونی مرۆڤ ڕووندەکاتەوە، کە وەکو ماینێك وایە پێویستی بە مەشق و ڕاهێنان و ئارامگرتن هەیە لە پەروەردەکردنیدا، هەروەها دەبێت زانیاری هەبێت لەسەر ئەو شتانەی کە دڵ و دەروون پاك و خاوێن دەکەنەوە، ئەگەر مرۆڤ زیادەڕۆیی بکات لەو زانست و زانیاریەدا و لەو ڕاهێنانەدا، ئەوە لە کۆتاییدا زۆر بە توندی پەشیمان دەبێتەوە.

**نموونەی دووەم:** ئەمەشیان ئیمامی ئیبنولقەییم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) بۆمان دەهێنێتەوە و دەفەرموێت: نەفس و دەروون وەکو شاخێکی مەزن و سەخت وایە لە ڕێگای

ڕۆیشتن بەرەو پەروەردگار، هەموو ڕێبوارێکیش هیچ ڕێگایەکی تری نییە جگە لەو شاخە و هەر دەبێت لەو ڕێگایەوە بڕوات، بەڵام هەندێك لای قورس و سەختە، هەندێکیش لای ئاسانە، وە بەڕاستی لای ئەو کەسەی زۆر ئاسانە کە خوای گەورە بۆی ئاسان کردووە.

لەسەر ئەو شاخە دۆڵ و ڕێگای سەخت هەیە، بەربەست و کەند هەیە، دڕك و تووو دڕك هەیە، هەروەها چەتە و ڕێگری لێیە و ڕێ لە ڕێبواران دەگرن، بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە بەشەودا ئەو ڕێگایە دەبڕن.

هەر بۆیە ئەگەر توێشووی ئیمان و بیروباوەڕیان پێ نەبێت و چرای دڵنیایی کە بە زەیتی خشوع و خۆ بەکەمزانین ئیش بکات، ئەوکاتە ئەو بەربەستانەی باسمان کرد ڕێگری لێ دەکەن و ئەو دڕك و داڵانە لێی دەئاڵێن و ناهێڵن بەڕێگادا بڕوات.

بەڕاستی زۆربەی ڕێبوارانی ئەو ڕێگایە بە شوێنی خۆیاندا گەڕاونەتەوە کاتێك کە نەیانتوانیوە ئەو ڕێگایە ببڕن و بەربەستەکان تێپەڕێنن.

شەیتانیش لەسەر لووتکەی ئەو شاخەیە، ڕێبواران ئاگادار دەکاتەوە لە سەختی سەرکەوتن و بەرزی شاخەکە و دەیانترسێنێت، هەر بۆیە: سەختیی سەرکەوتن و دانیشتنی ئەو ترسێنەرە (شەیتان) لەسەر لووتکەکەی و لاوازی نییەت و هیممەتی ئەو ڕێبوارە یەکدەگرێت و ئەو دابڕان و گەڕانەوەیە دروست دەکات، بێ هەڵە و پەڵەش ئەو کەسەیە کە خوای گەورە لە هەڵە و پەڵە بیپارێزێت.

هەر بۆیە هەرکاتێك ڕێبوارێك بیەوێت بەسەر ئەو شاخەدا سەرکەوێت بانـگ و هاواری ڕێگرەکە بەرز دەبێتەوە و ئاگـاداری دەکـاتەوە و دەیترسـێنێت، ئەگەر توانیی ئەو بەربەستانە ببڕێت و بگاتە لووتکەی شاخەکە، ئەوکـاتە هەمـوو ئەو مەترسیانە هەڵدەگەڕێنەوە و دەبێتە شوێنێکی بێ مەترسی، ئەوکـاتەش ڕۆیشـتن ئاسان دەبێت و بەربەستەکانی سەر ڕێگاکە نامێنن، سەختی و ناڕەحەتیەکانیش نامێنن، ڕێگـایەکی فـراوان و بـێ کێشـە و مەترسـی دەبینێـت کە بەرەو ئـاو و ئاوەدانی دەیبـات، وە شـوێنی نیشـتەجێ بـوونی تێـدایە کە ئامـادە کـراوە بـۆ ڕێبوارانی کاروانی ڕێگای خوای بەبەزەیی.

هەروەها لەنێوان بەندە و گەیشتن بە بەختەوەری و ڕزگاری: هـیممەت بەرزی و ئـــارامگرتن و ئـــازایەتی نەفـــس و دەروون و چەســـپاوی دڵە، وە فەزڵ و بەخشش و ڕێزیش لە دەسەڵاتی خوای گەورەدایە دەیبەخشـێت بەو کەسـەی بیەوێت و شایستە بن، هەر خواش خاوەنی فەزڵ و بەخششی گەورەیە .

ئەم نمـوونەیەش بەهەمـان شـێوە بـارودۆخ و جۆرەکـانی نەفـس و دەروون ڕووندەکاتەوە، کە خاوەنەکەی پێویسـتی بەوەیە پەیمـان بـدات و چارەسـەر و تیماری دەردەکانی دەروونی بکات، چونکە ئەگەر بەڕێگایەکی شەرعی ڕاسـت و دروسـت چارەسـەری نەکـات و جیهـادی نەفسـی نەکـات، ئەوە لەدەسـتی دەردەچێت و نەفس و دەروونی خۆی وون دەکات.

# ئەنجام

لەپاش ڕوونکردنەوەی ئەو بنەمایانە کە هاوکاری بەندە دەکات لە تەزکیە و پاك و خاوێنکردنی دەروونیدا، بۆمان ڕووندەبێتەوە کە دەروون چەند پێویستی بە لێپێچینەوەیە تا لەم دونیایەدایە و توانای کارکردنی هەیە پێش ئەوەی مرۆڤ لەبەردەستی پەروەردگاری ڕاوەستێت لە ڕۆژی دواییدا، لە کاتێکدا کەمتەرخەمبووە لە پاك و خاوێنکردنی دەروونیدا، کە بووە بە هۆکاری فەوتان و لەناوچوونی.

هەر بۆیە پێشینە چاکەکانمان خەڵکیان ئاگادار دەکردەوە و ئامۆژگاریان دەکردن بە گرنگی دان بە لێپێچینەوە لە نەفس و دەروون و پاك و چاککردنی، پێش ئەوەی مردن یەخەی بگرێت و کار لەکار بترازێت، هەر بۆیە لە کۆتایی ئەم پەیامەدا چەند وەسیەت و ئامۆژگارییەکی ئەو زانایانە باس دەکەین و لە پێش ئەوانیشەوە هەرچوار خەلیفەی راشدین:

- یەکەم خەلیفەی راشد ئەبوبەکری سدیق (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرموێت: (اعْلَمُوا عِبَادَ اللَّهِ أَنَّكُمْ تَغْدُونَ وَتَرُوحُونَ فِي أَجَلٍ قَدْ غُيِّبَ عَنْكُمْ عِلْمُهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْقَضِيَ الْآجَالُ، وَأَنْتُمْ فِي عَمَلِ اللَّهِ فَافْعَلُوا وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا ذَلِكَ إِلَّا بِاللَّهِ، فَسَابِقُوا فِي مُهَلِ آجَالِكُمْ قَبْلَ أَنْ تَنْقَضِيَ آجَالُكُمْ فَيَرُدَّكُمْ إِلَى سُوءِ أَعْمَالِكُمْ، فَإِنَّ قَوْمًا جَعَلُوا آجَالَهُمْ لِغَيْرِهِمْ وَنَسَوْا أَنْفُسَهُمْ، فَأَنْهَاكُمْ أَنْ تَكُونُوا أَمْثَالَهُمْ فَالْوَحَا

الْوَحَا[١]، ثُمَّ النَّجَا النَّجَا، فَإِنَّ وَرَاءَكُمْ طَالِبًا حَثِيثٌ مَرُّهٌ سَرِيعٌ - يعني الموت)[٢]، واتە: ئەی بەندەکانی خودا بزانن کە ئێوە دەڕۆن و ماڵئاوایی دەکەن لە کاتێکدا کە ئەو کاتە لەئێوە شاراوەیە، ئەگەر توانیتان لەکاتی مردنتاندا لە کردەوەیەکدا بن لە پێناو خوابێت ئەوە بیکەن، کە بێگومان ناتوانن ئەوە بکەن ئەگەر خوای گەورە یارمەتیتان نەدا، بۆیە پێشبڕکێ بکەن لەو دەرفەتەی لەبەردەستاندایە، پێش ئەوەی کاتی مردنتان بێت و بە خراپترین کار و کردەوەتانەوە بگەڕێنەوە، چونکە گەلانێك خەریکی کەسانی تر بوون خۆیان لەبیرکرد، ئاگادارتان دەکەمەوە کە وەکو ئەوانە بن، هەر بۆیە پەلە بکەن پەلە بکەن، پاشان ڕزگار دەبن ڕزگار دەبن، چونکە داواکەرێك بەدواتانەوەیە زۆر بەخێرایی پێتدەگات - واتە مردن -.

- پاشان خەلیفەی دووەمی موسڵمانانیش عومەری کوڕی خەتتاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرموێت: (حَاسِبُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحَاسَبُوا، وَزِنُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُوزَنُوا، وَتَزَيَّنُوا لِلْعَرْضِ الأَكْبَرِ، يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لا تَخْفَى مِنْكُمْ خَافِيَةٌ)[٣]، واتە: لێپێچینەوە لەخۆتان بکەن پێش ئەوەی لێپێچینەوەتان لەگەڵ بکرێت، هەروەها خۆتان کاروکردەوەی خۆتان کێشانە بکەن پێش ئەوەی خوای گەورە کێشانەی بکات، وە بەکردەوەی چاك خۆتان جوان بکەن و خۆتان ئامادە بکەن

[١] (فالوحا الوحا) لەزمانی عەرەبیدا دەوترێت: توحَّيت توحِّياً ، کاتێك پەلە بکەیت و خێرا بیت، لێرەشدا واتە: پەلە بکەن پەلە بکەن. {بڕوانە : کتێبی (النهاية) ی ئیبن ئەسیر (١٦٣/٥)}.

[٢] ئیبن ئەبی شەیبە لە (المصنف)ـدا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٥٥٧٢).

[٣] ئیبن ئەبی شەیبە لە (المصنف)دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٥٦٠٠).

بـۆ ئەو ڕۆژەی کردەوەکانتـان پیشـان دەدرێـت، لەو ڕۆژەی کە کردەوەکانتـان پیشان دەدرێن هیچ شتێك لە نهێنیەکانتان شاراوە نییە.

• پاشــان خەلــیفەی ســێیەمی راشــد عوســمانی کــوڕی عەفـان (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) دەفەرموێت: (ابنَ آدَمْ! اعْلَمْ أَنَّ مَلَكَ المَوْتِ الَّذي وُكِّلَ بِـكَ لَـمْ يَـزَلْ يُخْلِفُـكَ وَيَتَخَطَّى إِلَى غَيْرِك مُنْذُ أَنْتَ فِي الدُّنْيَا، وَكَأَنَّهُ قَدْ تَخَطَّى غَيْرَكَ إِلَيْـكَ، وَقَصَـدَكَ، فَخُذْ حِذْرَكَ، وَاسْتَعِدَّ لَهُ، وَلَا تَغْفَلْ فَإِنَّهُ لَا يَغْفَلُ عَنْكَ.
وَاعْلَم ابْنَ آدَمَ إِنْ غَفَلْتَ عَنْ نَفْسِكَ وَلَمْ تَسْتَعِدَّ لَهَا لَمْ يَسْتَعِدَّ لَهَـا غَيْـرَكَ، وَلَابُـدَّ مِنْ لِقَاءِ اللَّهِ، فَخُذْ لِنَفْسِكَ وَلَا تَكِلْهَا إِلَـى غَيْـرِكَ)[1]، واتە: ئەی نەوەی ئـادەم! بزانە کە ئەو فریشتەی گیانکێشـانەی کە لە ئامادەباشـیدایە بـۆ ئەوەی گیانـت بکێشێت بەردەوام بەدواتەوەیە و لەوەتی لەسەر ئەم دونیایەیت تۆ تێدەپەڕێنێت بۆ کەسانی تر، هەروەك چۆن کەسانی تریش تێدەپەڕێنێت بۆ تـۆ و دەتکـات بە ئامانجی خۆی، بۆیە ئاگادار بە، خۆتی بۆ ئامادە بکە و غافڵ مەبە، چونکە ئەو لە تۆ غافڵ نابێت.

هەروەها ئەی نەوەی ئادەم بزانە ئەگەر خۆت غافڵ بکەیت لە نەفسی خۆت و ئامادەی نەکەیت، ئەوە کەسی تر خەمی نەفسی تـۆی نـیە و ئامـادەی ناکـات، هەروەها بێگومان ڕووبەڕوونەوەی خوامان لەپێشە، بۆیە خـۆت نەفسـی خـۆت ئامادە بکە بەکەسی تری مەسپێرە.

---

[1] ئەبوبەکری دەینوری لە (المجالس و الجواهر)دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٧).

• هەروەها خەلیفەی چوارەمی راشد عەلـی کـوڕی ئەبـو تالیـب (رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ) دەفەرموێـت: (يَـا أيهـا النَّـاسُ إِنَّ أَخْـوَفَ مَـا أَخـافُ عَلَـيْكُم طُـولَ الْأَمَـلِ وَاتِّبَاعُ الْهَوَى، فَأَمَّا طُولُ الْأَمَلِ فَيُنْسِي الْآخِرَةَ، وَأَمَّا اتِّبَـاعُ الْهَـوَى فَيُضِـلُّ عَـنِ الْحَقِّ، أَلَا إِنَّ الدُّنْيَا قَدْ وَلَّتْ مُدْبِرَةً، وَالْآخِرَةُ مُقْبِلَةٌ، وَلِكُلٍّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَـا بَنُـونَ، فَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الْآخِرَةِ وَلَا تَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ الْيَوْمَ عَمَلٌ وَلَا حِسَابٌ، وَغَدًا حِسَابٌ وَلَا عَمَلٌ)[١]، واتە: ئەو شتەی کە زۆر ئەترسم تووشی ببن؛ هیـوا دریژی[٢] و شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووە، چـونکە هەرکەس هیـوا درێـژ بێـت قیامەتی بیر دەچێتەوە و هەرکەسیش شوین هەوا و ئارەزوو بکەوێت دژایەتـی حەق دەکات.

ئەوە دونیاش پشـتی تێکـردین و ڕۆیشـت و دواڕۆژیـش بەرەو ڕوومـان دێـت، هەریەکێك لە دونیا و دواڕۆژ ڕۆڵەی خۆیان هەیە، ئێوە لەڕۆڵەکانی دواڕۆژبن و لە ڕۆڵەکانی دونیا مەبن، چونکە ئەمڕۆ ڕۆژی کـار و کـردەوەیە بـێ پرسـینەوە، بەڵام سبەی ڕۆژی پرسینەوەیە بێ کار و کردەوە.

• حەسەنی بەسری (رَحِمَهُٱللَّهُ) دەفەرموێت: (المؤمنُ قَوَّامٌ عَلَى نَفْسِهِ، يُحَاسِبُ نَفْسَهُ لِلَّهِ، وَإِنَّمَا خَفَّ الحِسَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى قَوْمٍ حَاسَبُوا أَنْفُسَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَإِنَّمَـا شَـقَّ الْحِسَـابُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ عَلَـى أَقْـوَامٍ أَخَـذُوا هَـذا الْأَمْـرَ مِـنْ غَيْـرِ

---

[١] ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە بە فەرموودەیەکی موعەلەق پێش ژمارە (٦٤١٧) .

[٢] مەبەسـت لە هیـوا درێـژی ئەوەیە کە بەنـدە هیـوا و ئـاواتی دونیـایی زۆر دووری هەبێـت وای لـێ بکـات دواڕۆژی بیربچێتەوە (و).

مُحَاسَبَةٍ)[1]، واته: ئیمانـدار پەرپرسیاری نەفس و دەروونی خۆیەتی و لێپرسینەوە لە نەفسی خۆی دەکات، لێپرسینەوەی قیامەت لەسەر ئەو کەسە ئاسان دەبێت کە لە دونیادا لێپرسینەوەیان لەگەڵ نەفسی خۆیان کردووە، بەڵام قورس دەبێت لەسەر ئەو کەسانەی کە لە دونیادا لێپرسینەوەیان لە نەفسی خۆیان نەکردووە.

• مەیمونی کوڕی میهران (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەفەرموێت: (لَا يَكُونَ الْعَبْدُ تَقِيًّا حَتَّى يَكُونَ لِنَفْسِهِ أَشَدَّ مُحَاسَبَةً مِنَ الشَّرِيكِ لِشَرِيكِهِ)[2]، واتە: بەندە بەکەسێکی لەخواترس ناژمێردرێت ئەگەر لەهاوبەشێك بۆ هاوبەشەکەی زیاتر لە نەفسی خۆی نەپرسێتەوە.

هەر لەبەر ئەمەش وتراوە: (النَّفْسُ كَالشَّرِيكِ الْخَوَّانِ، إِنْ لَمْ تُحَاسِبْهُ ذَهَبَ بِمَالِكَ)[3]، واتە: نەفس وەکو هاوبەشێکی خیانەتکار وایە، ئەگەر لێی نەپرسیتەوە پارە و سامانەکەت دەبات.

هەر بۆیە ئەم پێگەیە دڵنیای ئەوەت پێ دەدات کە لەم سەردەمەدا کە فیتنە و شەڕانگێزی و هۆکاری بەلاڕێدابردنی خێر و چاکە زۆر بووە، هەروەها ئەو هۆکارە خراپانەش زۆر بووە کە سەرنجی باتڵ و ناحەق بەرەو لای نەفس ڕادەکێشێت و دەیڕازێنێتەوە.

[1] ئیبن موبارەك لە (الزهد)دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٠٧).
[2] وەکیع لە (الزهد)دا ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٣٩).
[3] بڕوانە (إغاثة اللهفان)ـی ئیبنولقەییم (١٣٣/١).

• هەر بۆیە ئیمامی عبداللەی کوڕی موبارەك (رَحِمَهُٱللَّهُ) - یەکێکە لە زانا مەزنەکانی تابعین - لەبارەی سەردەمی خۆی دەفەرموێت: (إِنَّ الصَّالِحِينَ فِيمَا مَضَى كَانَتْ أَنْفُسُهُمْ تواتِيهم عَلَى الْخَيْرِ عَفْواً، وإِنَّ أَنْفُسَنَا لَا تَكَادُ تواتِينا إِلَّا عَلَى كُرْهٍ، فَيَنْبَغِي لَنَا أَنْ نُكْرِهَهَا)[1]، واتە: پیاوچاکان لە پێشوودا دڵ و دەروونیان ڕێگای خێر و چاکەی پیشان دەدان، بەڵام دڵ و دەروونی ئێمە تەنها ڕێگای ڕق و کینەمان پیشان دەدات، بۆیە پێویستە لەسەرمان کە ڕقمان لێی بێت.

دەبێ بۆ سەردەمی ئێمە چی بفەرموێت؟!

لە کۆتاییدا دەپاڕێینەوە لە خوای باڵادەست و دەڵێین: نسأل الله تعالى بأسمائه الحسنى و صفاته العليا أن يصلح لنا ديننا الذي هو عصمة أمرنا، أن يصلح لنا دنيانا التي فيها معاشنا، وأن يصلح لنا آخرتنا التي فيها معادنا، وأن يجعل الحياة لنا زيادة في كل خير، والموت راحة لنا من كل شرّ.

اللهم آت نفوسنا تقواها، وزكها أنت خير من زكاها، أنت وليها ومولاها.

وصلى اللّٰه على نبينا محمد، وعلى آله وصحبه وسلم.

[1] ئیبنولجەوزی لە (ذم الهوى)دا ڕیوایەتی کردووە (لا٤٧) .

# ناوەڕۆک